
چون ابر بنوروز رخ لاله بشست
برخیز و بجام باده کن عزم درست
کاین سبزه که امروز تماشاگه تست
فردا همه از خاک تو برخواهد رست

## خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی موکریانی

- **با خەییام باش بناسین**
- **نووسینی:** جەلال زەنگابادی
- **وەرگێڕانی:** حەمە کەریم عارف

---

* **پیتچنین وهەڵەگریی :** ج . زەنگابادی
- **نەخشەسازی ناوەوە:** رێدار جەعفەر و محەمەد فەیسەل زەنگنە
- **بەرگ: ئامانج ئەمین**
- **نرخ:** ٣٥٠٠ دینار
- **چاپی یەکەم:** ٢٠١٣
- **تیراژ:** ٧٥٠ دانە
- **چاپخانە:** چاپخانەی **موکریانی** (هەولێر)
- **لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانەکان ژمارەی سپاردنی (٨٤٣)ی ساڵی (٢٠١٢) پێدراوە**

**زنجیرەی کتێب (٦٨٦)**



ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com

# ناوەڕۆك

# هووم

" قـــيـــلَ إنّ الإلـــــهَ ذو ولـــــــدٍ
قيــلَ إنّ الـــرســـولَ قَـدْ كـهـنا
مانـجى اللّهُ والـرّســولُ مـعـــــاً
مِـــنْ لســانِ الــورى فكيـفَ أنـــا؟!"

وتيان خوا كوڕى هەيە ،
وتيان پێغەمبەر جادووبازيكردووە
جا خواو پێغەمبەر پێكەوە
لــە زمانى خەڵك رزگاريان نەبووە
ئەدى منى بەندە چۆن رزگارمبێ لەم و لەوە؟!

# پێشکەشە بەم

**وێژەڤان و رۆشنهزرە میهرەبان و هێژایانە :**

**د. محەمەد نووری عارف**

**خوسرەو جاف**

**محەمەد سەعید جاف**

**نەوزەت دهۆکی**

**(ج.ز)**

# وەربەرە

پێشەکی و پاشەکی زۆر سوپاسی وێژەڤان و پاچڤەوانی پایە بەرزو کوردپەروەر حەمە کەریم عارف دەکەم و، پڕ بەدڵ دوعای تەمەن درێژیی بە پڕ بەرهەمی و سەرفرازی بۆدەکەم ، کە پاچڤەی ئەم پەڕتووکەی گرتە ئەستۆی خۆی و بە ئەوپەڕی وردییەوە وەریگێڕایە سەر زمانی کوردی شیرینمان .

ئەم پەڕتووکە لە بناغەدا بەشێکە لە پەڕتووکی (دیوان عمر الخيّام، دراسة وترجمة منثومة) کە لە ساڵی ٢٠١٠ لە (منشورات الجمل- لوبنان) پەخشبۆتەوە **(*)** بەلاّم گەلێك زیادو دەسکاری و پوختە کراوەو، سەرناڤەکەی لە سەرناڤی پەڕتووکی (کوردو خەیام نەناسین) ی خوسرەو جافەوە - وێژەڤانی گەورەو پێشەنگی خەییامناسیی لە زمانی کوردیدا — هەڵێنجراوە .

ئەوەی هەژی ئامـاژەیە ، چ بەیتێك یا پارچە هۆزانێك یان چوارینەیەك لەم پەڕتووکەدا هەیە بەخۆم پاچڤەمکردووەو، بگرە بە خۆشم پیتچن و هەڵەبژاری پەڕتووکەکەم کردووەو، گەلێك پەیڤگەلی دەڤۆکێن کوردیم بەکارهێناوە ، بەمەبەستی نزیککردنەوەی شێوەزارەکان لە یەکدی و لەپێناو زمانی وێژەڤانیی یەکگرتوودا.

سەرباری ئەوەش بە پێویستم زانی ڕێگاچارەیەك بدۆزمەوە بۆ ئـەو پیتانـە کـە لـە ئەلیفبای کوردیدا نین ، بـۆ زانـینی ئەسـڵیان و کرککردنـی ڕاسـت و وردیـان ، بـەم شێوەیە:

**(سۡ= ث)**

**( زٚ= ذ )**

**( تۭ = ط)**

**زۭ= ض ، ظ)**

لێرەشدا ئێژم زۆر بەداخەوە ، کە لە دەیان جۆری فۆنتی کـوردی یـەك جـۆرە فـۆنتی پوختەمان نیە ، بۆ نموونـە لـە هـەموویانا ئـەم فاریزەیـە (؛) نیـە ، کـە ڕۆڵـی لـە خاڵبەندیدا زۆر گرنگە ، بۆ ڕوونکردنەوەی پەیوەندیی دوو ڕستە یان دوو دەسـتەواژە، کە پەیوەندیی (هۆ) و(ئەنجام) لە نێوانیانە و، پیتی (ڤ ) ی کۆتایی پەیڤگـەل مینـاك لە پەیڤی (مرۆڤ) دا کلکبڕاوە!

هەڵبەتە دیاریکردنی مێژوویێن لەدایکبوون و مردنی هـەموو ئەوانـەی ناوەکانیـان دێنە ئاراوە زۆر گرنگە ، بۆیەش ئەوپەڕی بایەخم پێی داوە ، جا ئەو مێژوویانەی کـە بەم جۆرە تۆمارکراون : (؟...) واتە : دەوروبەری ئەو ژمارەیەو، مەزەندەئامێزە/ (؟!) واتە : مێـژووی لـەدایکبوون ومردنـی نادیـارە/ **(ل:):** مێـژووی لەدایکبوونـە/ **(م:):** مێژووی مردنە.

نامەوێ لێرەدا ئاماژە بۆ ئەو کفشە نوێیانەم لە بیافی خەییاملۆجیدا بکەم ، هەڵبەتە ئەو ویژەڤان و ڕۆشنهزرە کوردانـەی ئاگـاداری وێـژەی فارسـین ، نـەمازە لـە بـواری خەییامناسیداو، خودانێن ویژدانن ، باش دەزانن کە ئەم پەڕتووکە ناچێتە نێو بازنەی "کالآی خۆمانەو بۆمان ناردیانەتەوە"، بگرە هەژی پاچڤە شە بۆ زمانی فارسی .

لەبنەتادا تکای سەرەکیم ئەوەیە ، کە پێش داوای لێبووردن و بەخشین سەبارەت بە هەڵەکانم ، دگەڵ ئەوپەڕی سوپاسدا، داوا لە رەخنەگرانی ویژداندار دەکەم ، هەڵەکانم بۆ راستکەنەوە ، چونکە هەر هەڵەیەك دەبێتە هۆی زاوزوێی چەندین هەڵەی دیکە لە ئایندەدا.

کەماڵیش هەر بۆ یەزدانی مەزنە.

**(*) هەژی ئاماژەیە کە پاچڤەوانی گەورەمان حەمە کەریم عارف دەقی لێکۆڵینەوە عەرەببیەکەی (دیوان عمر الخیام...) ی وەرگێڕاوە سەر زمانی کوردی و بەخۆشم گەلێك زیادو دەسکاری و پوختەو پیتچنمکردو، دیسان مامۆستا حەمە کەریم بە ئەوپەڕی وردیی پێداچووەوە .**

**(ج.ز)**

**تەمووزی ٢٠١٢**

**هەولێر- نزیکی گۆڕستانی شێخ ئەحمەد**

# خەییام

## (شاعیری زانایان و زانای شاعیران)

**"عەجایەب!**

**من چ خزمەتێکی سوڵتان دەکەم؟!**

**دەبێ ئاسمانان هەزار ساڵ بەژانەوە بن و ستێران لە خولگەکانا لە هەڵکشان وداکشاندا بن ، تا لەم ئاشەدا دەنکە دانەوێڵەیەکی وەك عومەری خەییام دەرچێت و، لە شارانی حەوت نهۆمی ئاسمان و گوندانی حەوت دۆڵانی زەمیندا سەرقافڵەیەکی کاروانی حیکمەتی وەك من پەیدابێ! بەڵام ئەگەر خەواجە سەرات دەوێ ، ئەوا دەتوانم لە هەر گوندێکی دەڤەری کاشاندا دە دانەت لەو خەواجانە بۆ بێنم!"**

خەییام بەو جۆرە بەرسڤی خەواجە کاشانی (دیواندارو گەورەی دەستوپیوەندو خوڵامانی دەرباری سەلجووقی) دایەوە ، چونکە خەواجە ئەوەی بەزۆر دەزانی بۆ خەییام ، کە مەلیکشای سەلجووقی مووچەیەکی تایبەتی بۆ بڕیبۆوە ، جا نەك هەر مووچەکەی بەزۆر دەزانی ، بگرە بەم پرسیارەش تووڕەی کرد:

**- " تۆ چ خزمەتێکی سوڵتانی جیهان دەکەی، تا ساڵانە دە هەزار دینارت بداتێ؟!"**

هەر کە سوڵتان ئەم حیکایەتەی بیست ، گوتی :

**-" ئویاڵ وەئەستۆم خەییام راستی گوتووە"**

بێگومان ئەمە حاڵی فلیڤانانە لەنێو هاوڕەگەزانی خۆیانا، بەڵام شکۆو جاویدانی بۆ گرگنانی فووتێکراوو زەبەللاحکراوان نیە ، بەڵکو بۆ بلیمەتانی راستەقینەیە وەك : مەعەڕڕی ، خەییام و دانتی...

دیارە هیچ شاعیرێکی رۆژهەڵاتی ، نەمازە چوارینە بێژە ئێرانییە نێودارەکانیش مینا: بابا تاهیری هەمەدانی (؟۱۰۰۰-؟۱۰۷٥ ز)، مەسعوود سەعەد سەلمان (۱۰٤٦-۱۱۲۱)، مەهستی گەنجەوی (؟ ۱۰۸۹ -؟ ۱۱٥۹)، خاقانی شێروانی (۱۱۲۰-۱۱۹۸)، فەریدەددین عەتتاری نیشابووری (۱۱٤۲-؟ ۱۲۲۹)، کەمالەددین ئیسماعیل (م: ۱۲۳۷)، بابا ئەفزەڵ کاشانی (؟ ۱۱۸٦-؟ ۱۲٦۷)، مەولانا جەلالەددین روومی (۱۲۰۷-۱۲۷۳)، جەمالەددین سەلمان ساوجی (۱۳۰۰- ۱۳۷٦) و سەحابی ئەسترابادی (م:؟ ۱٦۰۱) بگرە بە هەموویانەوە ، لە ماوەی ئەم سەدو پەنجاساڵەی دواییەدا بەقەد خەییام (؟ ۱۰۲۱-؟ ۱۱۲۳) نەبوونەتە جێگەی بایەخی پاچڤەوانان و باسکاران لە سەرانسەری جیهاندا، تەنانەت کار گەییە رادەیەك خەریکبوو کەڵە نووسەرو شاعیرانی ناوازەی ئەوروپای وەك : دانتی (۱۲٦٥-۱۳۲۱)، سێرڤانتیس (۱٥٤۷-۱٦۱٦)، شەکسپیر (۱٥٦٤-۱٦۱٦)، گوێتە (۱۷٤۹- ۱۸۳۲) و پێشبینی بەنێوبانگ (پزیشك و شاعیر) نوستەر ئادامۆس (۱٥۰۳- ۱٥٦٦) بخاتە بەر سیبەری خۆی!

بەڵێ... پاش کەشفکردنەوەی خەییام وەکو شاعیر لە سەرەتاکانی سەدەی نۆزدەیەمداو، پاشان بەتایبەتی لەنیوەی دووەمی ئەو سەدەیە ، بە فەزڵی پاچڤەکەی ئیدوارد فیتزجیراڵد (۱۸۰۹- ۱۸۸۳)، چوارینەکانی خەییام بۆ دەیان زمانی زیندووی جیهان ، کە ژمارەیان خۆی لە پەنجا زمانی ئەوروپای دەدا، هاتنە وەرگێڕان ، جگەلە زمانێن رۆژهەڵاتی ، تا زمانی ئیسپرانتۆش ! تەنانەت بە خەتی (برێل) ی تایبەت بە نابینایانیش پەخشکران ، سەرباری ئەوەش لە هەر زمانێکدا چەند جارێك پاچڤەکراوە

، به رادەیەك كە تیراژی چاپی چوارینەكانی خەییام جگەلـە ئینجیـل ئیـدی تـیراژی هەموو كتێبە بەناوبانگـەكانی جیهـانی بەزانـدووە! هەڵبەتـە كارەكـەی فیتزجیرالـّد (پاچڤەیەكی ئازادی چوارینەكانی خەییام)ـە دەنگدانەوەیەكی جەماوەری میللـی بـێ وێنەی پەیداكردو، چووە قووڵای ویژدانی هەڵگرانی كـەلتووری ئەنگلۆساكسـۆنییەوە، بگرە هەندێكیان وەكو پەندو قسەی نەسـتەق كەوتنـە سـەر زاران . لـەم بـارەوە لـە پێشـەكی چـاپی (پنگـوین) ی چـوارینەكانی خەییامـدا وا هـاتووە: "..وەرگێڕانـی چوارینەكانی خەییام لەلایەن فیتزجیرالّدەوە ، بەناوبانگترین وەرگێڕانـی ئەدەبییـە بـۆ سەر زمانی ئینگلیزی و، تەنانەت بـەناوبانگترین و جـەماوەریترین وەرگێڕانـی وەكـو پاچڤەكەی (هۆمیرۆس) ی (شابمان) یا پاچڤەكەی (ئۆڤید) ی (فۆڵدینگ) نەگەیشتۆتە هاوتای .

هەڵبەتە پاچڤەكەی فیتزجیرالّد ئاوێتەی تـانوپۆی زمـانی ئینگلیـزی بـووەو، بۆتـە بەشێكی لەجیابوونەوە نەهاتووی ئەو دەستەواژەو ئیدیۆم وقسە نەستەقە ئینگلیزییـە باوانەی كە پەندئاسا بەسەر زارەوەن و دەگوترێنەوە ، بە ڕادەیەك چـاپی سـاڵی١٩٥٣ی فەرهەنگی ئۆكسفۆرد لەكۆی ئەو(١٨٨ پەنـدو ئیدیۆمـە) ی كـە لـەخۆی گرتـووە (٥٩ چوارینەی تەواوی خـەییامی) تێدایـە ، واتـە ڕێـژەی چـوارینەكان دەبنـە سـێیەكی پەندەكانی ئەم تۆمارە. دیارە ئەم ڕێژەیە لە ڕێژەی ئەو گوتەو پەندانە زیاترن كـە لـە كتێبی پیرۆزو شەكسپیر وەرگیراون" ! لە هەمان پێشەكیدا هاتووە كە شاعیری مـەزن جۆن كیتس گوتوویەتی ، كە ئەگەر بەكەشتی سەفەربكات پێی خۆشـترە (وەرگێڕانـی چوارینەكانی خەییام) لەگەڵ خۆیدا بەرێت تا وەرگێڕانی (هۆمیرۆس)ـەكەی شـابمان! بگرە دەڵێن سەربازانی ئینگلیز لە سالآنی هەردوك جـەنگی جیهانیـدا چـوارینەكانی خەییامیان لەگەڵ خۆیانا دەبرد.

هەروەها زۆرجار سەرۆكی ئەمریكا ئەبراهام لینكۆڵن (١٨٠٩- ١٨٦٥) بەر لەنووستن چوارینەكانی خەییامی دەخوێندەوە ، فلادیمێر پۆتینی سەرۆكی رووسیش لەم خووەدا لە لینكۆڵن دەچێت .

مارتن لۆتەر كینگ (١٩٢٩- ١٩٦٨) پێشەوای زنگییەكانی ئەمریكاش لەگوتارێكیا قسەی خەییامی (بە پاچڤەی فیتزجیراڵد) بە نموونە هێناوەتەوە:

" خەییام ڕاستی گوتووە :

- دەستی قەدەری رۆیشتوو دەنووسێ و

هەر دەڕواو نازڤرێ نیوەدێرێ رەشبكاتەوە"

**ئەمەش پاشماوەی چوارینەكەیە :**

" بگرە هەرچەندیش خواپەرست و ژیر بیت

هەموو ئەشكت وشەیەك ناكوژێنێتەوە"

**دەقە فارسییەكەشی بەم نیوبەیتە دەستپێدەكا :**

" از رفتهء قلم هیچ دگرگون نشود"

**واتە:**

" لە نووسینی خامەدا هیچ ناگۆڕدرێ"

جا بەم جۆرە خەییام لەچاو گەورە شاعیرانی رۆژهەڵاتدا شۆرەت وناوبانگی جیهانگیری سەیری پەیداكرد ، گەرچی ئەحمەد حامد صەڕڕاف (١٩٠٠- ١٩٨٥) پێی وایە كە خەییام " لە ئەبوو عەلا و موتەنەببی و ئیبن روومی و ئەبوو نواس و حافز و سعدی و خاقانی و نیزامی بلیمەتتر نەبووە ، بەڵام خەییام لەوانە بەختەوەرتر بووە ، كە خەڵكانێك پەیدابوون قەدری ئەدەبەكەیان زانیوە و پێیاندا هەڵگوتووە ، دنیاش تاڵح و نسیبە "

هـــەق وابـــوو مامۆســـتا صـــەڕاف نـــاوی فیردەوســـی (؟ ٩٤٠-؟ ١٠٢٠) و ناصـــر خوسرەو(١٠٠٣- ١٠٨٨) و مــەولانا جەلالــەددین- یشــی بهانیبایــە ، دگــەڵ ئەوەشــدا بۆچوونەکەی دروست نیە ، چونکە بەخت و تاڵح هۆی سەرەکی شۆرەتی جیهــانگیریی خەییام نەبووە ، هەرچەندە بەخت تا رادەیەك پێویستە ، بــەڵام هۆیــەکی لاوەکییــە ، چونکە خەییام بــەتێکڕای کارەکــانی نــەك هــەر نــاوداریکی ئێرانیــی- ئیســلامیی- رۆژهەڵاتیی مەزنە ، بەڵکو لە ریزی گەورەترین ئەو ئەدیبە ناوبراوانەیە . جـا ئەگــەر بەکۆی هەموو بەرهەمەکانی هەڵسەنگێنرێت و، لە بواری شیعریشا گەرچی قــەوارەی دیوانەکەی بچووکە ، ئەگەر بەهای حزووری شیعریی لە زۆربەیان بەرزتر نەبێت ، ئەوا هیچی کەمتر نیە لەم خودان دیوانە بچووکانەی ئەدەبیاتی جیهاندا: لاوتسی (ســەدەی پێنجەم یا شەشەمی پێش زیینی) لە شیعرو هزری چینیدا، خۆرخێ مانریکی (١٤٤٠- ١٤٧٩) لە شیعری ئیسپانیدا و رامبۆ(١٨٥٤- ١٨٩١) لە شیعری فەرەنسیدا.

ئەمەیان لەڕووی پایەی ئەدەبییەوە ، کەچی سەبارەت بە پایەی هزریی ، فاکتەرێکی سەرەکیترو جەوهەریتر هەیە ، کــە لــە هــەموو ئاســتەکاندا بەنــدیوارە بــە ژینگــەی ئەوروپییەوە ، بە تایبەتی لــە نیــوەی دووەمــی ســەدەی نۆزدەیەمــدا، ئــەویش ئــەو ژینگەیە بوو کە ناڤەڕۆکی چوارینەکانی خەییامی پەسەندکردو لە هــەمێزی گــرتن و هەڵیمژین ئەما هەڵمژین !

لەو سەدەیەدا ئەوروپا هەڵکشانێکی شۆڕشگێڕانەی مۆدێرینستی بەخۆوە دەبینــی ، کــە لــەدوای پاشەکشــەی سیاســی قەڕاڵســتانەکانیاو، لــە هەڵکشــانی کەڵکەڵــەی عیلمانییەت و قانگڵەبوون و داکشانی دەسەڵاتی ئایینییا بەرجەستە دەبــوو... ئــەوە بوو باهۆزی شۆڕشێن : سیاسی ، ئەدەبی ، هونــەری ، زانســتی ، ئــابووری و هــزری هەڵیگرد، گەشترین نموونەشمان بڵاوبوونەوەی تێزو هزرەکانی : مارکس (١٨١٨- ١٨٨٣)

، دارون (١٨٠٩- ١٨٨٢)، فرۆیـــــد (١٨٥٦- ١٩٣٩) و پێشـــــەنگانی فەلســـــەفەی بوونگەرایی(وجوودی) یە .

سا نهێنی فەزڵی خەییام ، سەبارەت بە ڕەواجدانی زمانی فارسی لە ئاستی جیهاندا ، ڕەنگە لە فەزڵی ئـەو شـاعیرە ئێرانییـە نێوبراوانـە زیـاتر بێـت و، لەمەدایـە کـە چوارینەکانی هـەم سـووك و خۆشدەسـتن بـۆ وەرگێـڕان و هـەم پـڕ بـەهان لـەڕووی ناڤەرۆکەوە . هەڵبەتە ئەو پاچڤانەی کە دەقە فارسییەکەیان لەگەڵدایە ، بوونە مایەی ئەوەی سەرنجی ڕۆڵەکانی میللەتانی دی بۆ زمانی فارسی ڕاکێشن و، بکەونـە منـەی ئەدەبیاتی ئێرانی و خوێندنـەوەو لێکۆڵینـەوەی ، بـەو ئیحتوبـارەی کـە گـەورەترین دەروازەیە بۆ ژیـاری ئێرانـی ، جـا ئەمـەش بـووە هـۆی ئاشـنایەتی و هاوسـۆزی و دۆسـتایەتی لەگـەڵ ئێرانییەکانـداو، لـە دەرەنجامـدا دەکاتـە بەرزکردنـەوەی نـاوی نیشتمانەکەی خەییام ، واتە ناوی ئێران . ئەگـەر وا نیـە ئـەدی بۆچـی (بـۆ نموونـە) زانستگەی فلۆرنسا لە ئیتالیاو، لە بوخارێستی پێتەختی ڕۆمانیـاو، لـە ئیسـپانیادا پەیکەری بۆی کراوە؟ بۆچی ساڵانە خەڵکانێکی بیانی زۆر(بەتایبەتی ڕۆشـنبیران) لـە نیشابوور سەردانی گڵکۆی دەکەن...هتد؟!

بەڕاسـتی و دڵنیاییـەوە خـەییام (سـوڵتانی شـاعیرانی چـوارینەیە)کە بەدیوانـە چکۆڵەکەی (کە ١٠٩٦ چوارینەیە لە گـەورەترین کۆچـوارینەی پاچـڤەکراودا لەلایـەن باسکارو پاچڤەوانی هیندستانی سوامی گوڤیندا تیرتەهـە) ڕۆشـنبیران و ڕۆشـنبیریی هەموو نەتەوەو گەلەکانی جیهانی لێکدی نزیککردۆتەوە ، لەم ڕووەوە تەنانەت کتێبە پیرۆزەکانیشی بەزاندووە! مەگەر لەم مەیدانەشدا چـوار- پێـنج ئـەدیبێکی جیهـانی دیکە هاوتای بن مینا: دانتی و شەکسپیرو سێرڤانتس...

هەر بۆیەش دەتوانین بڵێین غەیاسەددین ئەبولفەتح عومەر کوڕی ئیبراهیمی خەییامی نیشابووری بەڕاستی و ڕاستەقانی (زانای شاعیران وشاعیری زانایان) ـە ، چونکە: زانا، فەیلەسووف ، گەردوونناس ، پزیشك ، نووسەرو شاعیر بوو.

❋

هەندێك بەهۆی نازناوەکەیەوە، کە (خەییام) ـە ، ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە رەنگە (عومەر ئیبراهیم) بەڕەسەن ونەژاد عەرەب بووبێت ، دیارە ئەمە بەڵگەیەکی یەگجار سست و لاوازە ، چونکە ئەم نازناوە هێمایەك نییە بۆ تیرە یان تایفەیەکی عەرەبی ، یاخود بۆ گوندێك یان شارۆچکەیەك یان شارێکی عەرەبی ، بەڵکو هێمایە بۆ ئەوەی کە لەوەیە باوکی عومەر یان باپیرەی خێوەت سازێکی بەنێوبانگ بووبێت و، ئیدی ئەم نازناوە بەسەر عومەردا بڕابێت . لەوەشە هەر بەخۆی حەزی لێکردبێت وەکو شانازییەك بەئەسڵ و فەسڵی زەحمەتکێشی خۆیەوە هەڵیبژاردبێت . هەروەها تاقە ئاماژەیەك بۆ کوردبوونی نەژادی خەییام رایگرتم ، کە شاعیرو وەرگێڕ مەلا خەلیل مشەختی (١٨٩٧- ٢٠٠٧) لە پێشەکی پاچڤەی چوارینەکانی خەییامدا بۆ سەر زاراڤەی ئەدەبی (کرمانجی سەروو) ئێژێ : " خەییام کوردێکی نیشابووری یە لە کوردەکانی خۆراسان" ، بۆیە کەوتمە پشکنین و چوونە بنجوبنەوانی ئەم ئاماژەیە وەك ئەگەرێك ، چونکە کورد لەپێش سەردەمی میدیاوە لەخۆراسان ودەوروبەریدا هەبوونەو ، لە هەردوك سەردەمێن ئەمەوی و عەبباسیدا، تەنانەت لە سەردەمی نوێشدا، لە مەیدانە رۆشنبیریی و سیاسیی و جڤاکییەکاندا زۆر کەڵەمێرد ونێوداری کورد رەچەڵەك لەو دەڤەرەدا هەڵکەوتوونە مینا: شاعیر بەسسام کوردی خارجی (م: ٨٧٨ ز) ، شاعیر ئەبوو لحەسەن عەلی لۆکری (م: لەکۆتاییەکانی سەدەی دەیەم) ،

ئەبوو موسلم خۆراسانی (بهزادان ڤنداد هرمز) (م: ٧٥٥)، بەرمەکییەکان (سەردەمی عەبباسی) ، ئەبوو **محەممەد** عەبدوڵڵا زۆزانی (م: ١٠٣٩ ز) و پادشایانی **کورت** (لە سەدەی ١٣ و١٤ ز)...خۆ ئەگەر ئاماژەیەك بۆ عومەری خەییام بە نێو (عومەر ئەبهەری) کراوە دروستبێت ، ئەوا دەشێت بگوترێ خەییام بەڕەسەن کوردە ، چونکە ئەبهەرییەکان کوردن ، ئەمەو جگە لەوەی کە خەییام سوننی مەزهەبە ونێوی (عومەر) ە، بەڵام نە باسکاری گەورە عەبدولحەمید سەججادی لە ئینسیکلۆپیدیاکەی (شاعیرانی کوردی فارسی زمان/ بە فارسی)، نە دکتۆر صدیق بۆرەکەیی لە (فەرهەنگی ناودارانی کورد/ بە فارسی) و، نە بابا مەردۆخی رۆحانی لە (مێژووی ناودارانی کورددا/ کە سێ بەرگە بە فارسی) ناوی عومەری خەییامیان بە کورد تۆمار نەکردووە ، کەواتە تا ئێستا هیچ بەڵگە و قەواڵە و سەنەدێك نیە بۆ دروستی ئاماژە تاقانەکەی شاد رەوان مەلا مشەختی . هەر بۆ ئاگاداریش ئەڵێم زۆربەی ئێرانییەکان فارس نین ، چونکە فارسەکان هەر لە دێر زەمانەوە تا ئێستا لەڕووی ژمارەوە نزیکەی سێیەکی ئێرانییەکان پێکدێنن .

❃

وەك چۆن راوبۆچوونی جیاوازو هەڤدژ سەبارەت بە رەچەڵەکی نەتەوەی خەییام هەس ، هەمان جیاوازی و هەڤدژی دەربارەی ساڵانی لەدایکبوون ومردنی خەییام هەیە ، بگرە زاگەکەشی ، کە گوتراوە لە گوندی شمشاد لە بەلخ ، یان گوندی بسنکی سەربە ئەسترئاباد لەدایکبووە ، بەڵام وێڕای ئەوەش رای زۆرینە بەلای ئەوەدا دەکشێت کە لەدایکبوون و مردنەکەی لەشاری نیشابوور بووە ، ئەو شارەی کە لە

سەردەمە بەراییەکانی ئیسلامیدا یەکێك لە مەڵبەندە کەلتووریە گەورەکان بووە ، بە رادەیەك دەڵێن پتر لە چوار هەزار ئەدیب و زاناو حەکیمی تێدا هەڵکەوتووە و چالاکی خۆیان تێدا نواندووەو، زەکەریبیا **محەممەد** قەزوینی (١٢٠٨- ١٢٨٣) لە کتێبی (مەنەرەکانی وڵات و سالۆخەکانی عیباد) دا ئێژێ : "...نیشابوور لە باشترین و خۆشترین وڵاتانی خودا بوو" و " جڤاتی زانایان و کانگەی هونەرڤانان بوو" کەچی هەندێك لە شاعیران زەمی نیشابووریان کردووە ، لەوانە : ئەبوو حەسەنی ئەسترئابادی و مەعەنی شەیبانی .

*

**عومەر خەییام** لە نیشابوور لای ئیمام موەففەقی نیشابووری(؟!) و ئیمام حەرەمەینی جوەینی (م: ١٠٨٥ ز) و ئەبوو حەسەنی ئینباری (؟!)خوێندویەتی و زۆری لەزانستەکانی خۆی هەڵێنجاوەو، ئەڵێن لەلای شێخ ناصرەددین مەنصوور- مامۆستای سەنائی- ش خۆێندوویەتی و، پاشان بۆ تەواوکردنی خوێندنی (جەبر) رووی کردۆتە (سەمەرقەند) و، هەر لەوێش لە گەردووناسی و ئەستێرەناسی و بیرکاریدا ناوی دەرکردووەو، ئەستێرەی بە رادەیەك بەرزبۆتەوە ، کە "خاقان شەمسولملووك لە بوخارا زۆری رێزدەگرت و لەسەر تەخت لەگەڵ خۆیدا دایدەنا" بە پێی (نوزهەتو لئەرواح و رەوزەتو لئەفراح) ی شەمسەددین شارەزووری (؟ ١١٦٥-؟ ١٢٥٠). دوای ئەوە جەلالەددین مەلیکشا(م: ١٠٩٢ ز) لە ساڵی (١٠٧٤ ز)دا ناردوویەتی بەشوێنیا و، لەگەڵ چەند زانایەکی تردا، لە ساڵی(١٠٧٩ ز) دا تەکلیفی کردووە ، کە چاکسازی ساڵپێوی ئێرانی بکات و، روانگەیەکی گەردووناسی لەئەصفەهاندا

دابمەرزێنێت . هەر بەگوتەی شارەزووری ، مەلیکشا " حەساوی رازگرو هاودەمانی خۆی بۆ دەکرد"

هەروەها ناوی خەییام لە چەند سەرچاوەیەکی سەنگین و پڕ ئیحتوباری دیکەدا بەڕێزو شکۆوە هاتووە ، لەوانە : (خەریدەتو لقەصر)، (میرصادو لعیباد)،(تاریخ جهانگشای)، (تاریخ گوزیدە)، (نوزهەتو لمەجالس) و(مونسو لئەحرار) و لە چەندین شوێنیکی تردا کۆمەڵێك لە کەڵە پیاوانی ئەو سەردەمە گەواهی باوەڕپێکراو دەدەن لەسەر پایەبەرزیی و شکۆداریی خەییام لە بوارێن زانست و ئەدەبیاتی سەردەمی خۆیدا. بۆ نموونە : ئەبوو لقاسم زەمەخشەری (١٠٧٥- ١١٤٤) ئاماژەی بۆ موناقەشەکانی لەگەڵیا کردووەو، زەهیرەددین بەیهەقی (؟ ١١٠٥-؟ ١١٧٠ ز) لە پەسەندیدا گوتوویەتی خەییام شارەزاترین و باشترین قورئان خوێنی زەمانی خۆی بووەو، دەشگێڕنەوە کە ئەبوو حامدی غەززالی (١٠٥٨- ١١١١) وانەی فەلسەفی لێوەرگرتووە و، لە زانستی ئاخاوتندا موناقەشە و گێنگەشەی لەگەڵدا کردووە.

❋

خەییام بەڕیزو حورمەتێکی کەم وێنەوە ناودەبرا: (ئیمام) ، (حوججەتو لحەق وەلیەقین)، (غەیاسەددین)، (نەصیرەددین)، (شای حەکیمان)، (فەیلەسووفی جیهان)، (پیری شکۆمەند)، (مەزنی تەحقیقکاران)، (ئەدیبی ئاوەزمەندی سامدار)، (گەردووناسی گەورە) و(دەستوور: پلەیەکی هاوتای وەزیر) و زۆر لە شاعیران و رۆشنهزرانی سەردەمی خۆی و پاشانیش بەڕێزو شکۆوە ناویان بردووە ، لەوانە شاعیری گەورە خاقانی شێروانییە (١١٢٠- ١١٩٨ز) کە لە لۆرینەکەی بۆ

مامی(کافیددین عومەر عوسمان) نـاوی هێنـاوەو، خەسـڵەت وسـیفەتە چـاکەکانی ژماردووە ، بەتایبەتی حیکمەت و دادپەروەرییەکەی :

**"...زان عقـل بدو گـفته که ای عمر عثمـان**
**هـم عـمـر خیّـامـی و هـم عـمـر خـطّـاب"**

"...بۆیە ئاوەز پێی وتووە ئەی عومەر عوســمان
تۆ هەم عومەر خەییامی و هەم عومەر خەتتاب"

جا بەحوکمی پایە بەرزی و شکۆمەندی خەییام ، شاعیری سۆفی بـەنێوبانگ سەنائی غـەزنەوی (م:؟ ١١٣٠ یا ١١٤٥) بـە نامەیـەك پـەنای بـۆ بـردووەو داوای لێکردووە لـە کێشـەیەك دەربـازی بکـات ، کـە بـەهۆی شـاگردێکی تووشـی هاتبوو، چونکە خۆلامێك برێك پارەی لە صەڕڕافێك دزیبوو، بە زەبری لێـدان دانی بە دزییەکەیا نابوو، بەڵام بۆ خۆپەڕاندنەوە گوتوبووی گوایە برە پارەکەی داوەتە شـاگردەکەی سـەنائی و، شـاگردەکەی سـەنائیش بـۆ خـۆ دەربـازکردن وتووبووی کە پارەکەی داوەتە سەنائی مامۆستای ! بۆیە سەنائی وەزع و حاڵی بەو ئۆینە گلاوە زۆر تێك چوبوو.

گەرچـی دەرەنجـامی ئـەم حیکایەتـە نازانرێـت ، لـێ پێدەچـێ کـە خـەییام نەیتوانیبێ یارمەتی سەنائی بدات ، بۆیەش سـەنائی پاشـان بـە چـەند دێـڕە شیعرێك ناڕاستەوخۆ خەییامی داشۆریوە! لەوەش سەیرتر هەڵوێستی عەتتاری نیشابوورییە ، کە هاوشاری خەییام بووەو، زۆر باش ئاگـای لـە چـوارینەکانی بووەو، بگرە بە باندۆریان و لاساییکردنەوەیان دەیان چوارینەی هەڵبەسـتووە،

که هەندێکیان زرەدزین ، کەچی لە (ئیلاهــی نامــه)دا بــە پیــاوێکی ناتــەواو ناوی خەییامی هێناوە!

" یکــی بــیـــنـــندەی مــعــروف بودی
کی ارواحــش همــه مکشوف بودی
دمــی گـــر بـــر سر گــوری رسیدی
در آن گـــور آنــچ مــیرفــتی بدیدی
بـــزرگــی امتــحــانی کــرد خُــردش
بــــه خـــاك عــمــر خــیّــام بُــردش
بدو گفتا چه می بینی در این خاك
مــرا آگـــه کــن ای بیــنـــندەی پــاك
جـــوابـــش داد آن مــرد گـــرامــی
که ایــن مــردی است انــدر ناتمامی .."

**واته :**

بینەرێکی بینایی تیژی ناســـراو هەبــوو
کە گشت گیانەیل بۆی کــفــش دەبـــــوو
گەر گاڤا بەسەر گۆڕێــك بگەیشـــتبایە
دەیـــدی هەرچی لەو گــۆڕە روویبـــدایــە
گەورەیــە ئیمتیحانێــکی گچــکــەی کرد
بردیە سەر گڵــکــۆی عــومــەری خەییام
پێی وت: ئەرێ چ دەبیـــنی لــەم خـــاکە

ئـەی بیـنـەری پـاك ئاگـادارم بكــەوە؟
ئـــەو پیـــاوە هێـــژایـە بەرسـڤـی داوە
كـــە ئەمەی تێـدایە مرۆڤەكی ناتەواوە

ئەوەی شایەنی باسە دەربارەی مێردمنداڵێتی خـەییام ، ئەوەیـە كـە وەزیـری ناوداری سەلجووقیان نیزامولمولك حەسەن تووسـی (١٠١٨- ١٠٩٢ ز) و حەسـەنی صەباح (؟ ١٠٣٧- ١١٢٤ ز) پێشەوای فیرقـەی ئیسـماعیلیی بـاتینی و حـاكمی قەڵاتی ئەلەمووت (هێلانـەی داڵاش) لـە منـداڵێتی و خوێندنیـدا لای ئیمـام موەففەقی نیشابووری لە قوتابخانەی خۆراسانی ئەوسا ، هاوڕێ و هەڤاڵی بوونە . كەچی هەندێك لە باسكاران حیكایـەتی هەڤخوێنـدن و برادەرایـەتییان لـەو سەردەمە و ئاكام و ئەنجامی دواتری چارەنووسی هەریەكـەیان بەحیكایـەتێكی سست و نادروست لەڕووی مێژووییەوە دەزانن ، بێ ئەوەی هیچ حیسـابێك بـۆ ئەو سەرچاوە میژووییە باوەڕپێكراوانەی پێشەوە بكەن ، هەموو بیانوویـەكیان تەنیا ئەوەیە كە نیزامولمولك لە وەچەیەكی پێش وەچەی خەییام وحەسەن صەباح بووە ، بگرە وەسیەتنامەكەی نیزامولمولك كە ئەم زانیاریانەی تێدا هاتووەو، لە كتیبی (ڕەوزەتولصەفا) ی محەمەدی مەحموود بـەلخی مـیر خوانـد (م: ١٤٩٧ ز) تۆماركراوە ، بەساختەو دەسكردی دەژمێرن . لە كاتێكا هەندێ باسكارانی دی ئەم حیكایەتە بەدروست دەزانن ، بە مەرجێك ئەگەر عومەر خەییام و حەسەن صەباح نزیكەی سەد ساڵێك ژیابن ، كەچی ئەوەش مەحاڵ نیـە ، چـونكە زۆر ئەدیب وزانا و هزرڤانی تەمەن درێژ لە سەردەمە كۆنەكاندا ژیاون .

بەنۆڕینی بەندە راوبۆچوونی ئەمانەی دوایی دروستە ، چونكە سەرچاوەو بەڵگەی زۆری لەســەرە ، وێـڕای بــەرواری لــەدایكبوونی خـەییام و صــەباح ، هەنـدێك

لەمێژوونووسان ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە خەییام لەسەرەتای دەیەی دووەمی سەدەی پێنجەمی کۆچیدا (چارەکی یەکەمی سەدەی یازدەی زایینی) لەدایکبووە، هەروەها **یان ریبکا** (١٨٨٦- ١٩٦٨) رۆژهەڵاتناسی چیکی و باسکارانی دیکەش ئەوەیان تۆمارکردووە کە خەییام لە دەوروبەری ساڵانی (١٠٢١- ١٠٢٣ ز) لەدایکبووە ، کە بەلامەوە لە راستییەوە نزیکترە ، چونکە خەییام بەخۆی بەڕاشکاوی گوتوویەتی لە قوتابیانی ئیبن سینا (٩٨٠- ١٠٣٧ ز) بووەو، ناوەڕۆکی هەندێك لە نامە فەلسەفییەکانی ئەوە دەسەلمێنێت و، ئەبوو نەصر محەمەد کوڕی عەبدولڕەحیم نەسەوی ئیمام و قازی دەڤەرێن فارس ، کە شاگردی ئیبن سینا بووە، برادەرێکی دڵسۆزی عومەر خەییام بووەو نامەکاری لەنێوانیان هەبووە، جگەلە ئاماژەی زۆربەی میژوونووسان بۆ ئەم زانیارییەو، نامە گۆڕینەوەو شیعر گۆڕینەوە لەنێوان خەییام و شێخ ئەبو سەعید ئەبولخەیر(٩٦٧- ١٠٤٩ز) و مێژووی لەدایکبوون و مردنی گەلێك لە هاونەسلان و هاوچەرخانی خەییام و پەیوەندی هەندێکیان لەگەڵیدا، ئەگینا چۆن سەرۆکایەتی لیژنەی هەمووارکردنی ساڵپێوی جەلالی و روانگەی ئەسفەهان لەنێو کەڵە زانایانی ئەو سەردەمەدا بە خەییام دەسپێردرا؟! ئایا دەبێ هەموو ئەو گەواه و بەڵگانەی کە لە زۆربەی سەرچاوە هەرە کۆن و رەسەنەکاندا هاتووەو ئەم بۆچوونە دەسەلمێنن بەدرۆبخەینەوەو بەساختەو دەستکردیان لەقەڵەم بدەین ، هەر بۆ ئەوەوی ئەو ئەگەرە رەتبکرێتەوە کە خەییام نزیکەی سەد ساڵ ژیابێت ، لەکاتێکا هەندێك لەمێژوونووسان ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە لەگینە خەییام (١٢٠ ساڵ) ژیابێت؟! دیارە ئەمەش مەحاڵ نیە ، چونکە خەییام داناو زاناو پزیشك بووەو زانیویەتی چۆن ئاگاداری تەندروستی خۆی بێت و جەستەی خۆی لە بەدکاری کوشندەدا بەفیڕۆ نەدات .

بەڵێ خەییام هەمیشە لە چوارینەکانیا جەختی لەسەر ئەوە کردووە کە قەدری تەمەن بزانرێت ، چونکە چەندەش درێژبێت هەر کورت و سنووردارە ، جگە لە گەواهی هەموو هاوساڵ و هاوچەرخەکانی ، بە ناحەزەکانیشەوە ، لەسەر رەوشت پاکی و رەفتاری جوانی . ئەوەتانێ لەم دوو چوارینەیەی کە دراونەتەپاڵی چەمان ئاماژە بۆ تەمەنی خۆی دەکا، کە ئێژێ :

" ئەی ئەوەی دەرکەوتم بە شینگی تۆ
صەت ساڵم رابوارد بە نازونیعمەتی تۆ
ڤێجا صەت ساڵ تاواندەکەم تا بزانم
گوناهم سەنگەتایە یان بەزەیی تۆ"

و:

" گریمان ئاواتی دنیات وەدیبێ ، ڤێجا چی؟
پەڕتووکی تەمەنیشت بخوێنی ، ڤێجا چی؟
گیرام صەت ساڵێك بە کامی دڵت رابوێری
بگرە صەت ساڵی تریش بژیت ، ڤێجا چی؟"

بۆیەش بەندە بۆ دەستنیشانکردنی ساڵی لەدایکبوونی خەییام دەوروبەری(١٠٢١- ١٠٢٣ ز)م پێ راستە و پێم وایە قوتابی ئیبن سینا بووە و، پەیوەندیشی لەگەڵ پیری سۆفی ئەبوولخەیر و شاعیر ناصر خوسرەو(١٠٠٣-١٠٨٨ز) هەبووەو، خەییام بەخۆی مامۆستای عەینولقوزاتی هەمەدانی (١٠٩٦- ١١٣٠ز)، عەبدوڕڕەحمان خازنی(م:؟ ١١٥٥)، عەرووزی سەمەرقەندی (م: ١١٧٤)، محەممەد ئیلاقی فەیلەسووف (؟!) و حەکیم عەلی محەممەد حیجازی قایینی(؟!) بووە، دەنا

مەحاڵە گەنجێك لە تەمەنی بیستساڵیدا بێت ، یان کەمێك لە سەرووی سی ساڵ بێت ، بتوانێ ئەو نامە زانستی و فەلسەفییە نایابانە بنووسێ و، سەرۆکایەتی کۆمەڵێك زانای گەورە لە پرۆسەی هەموارکردنی ساڵپێوی ئێرانی بکات؟! بەڵگەشم ئەمەیە کە ئەو جۆرە نووسین و چالاکییانە بەبێ رۆشنبیریی وئەزمونێکی سی- چڵ ساڵی نایەتە بەرهەم ، چونکە ئەمە وەکو هۆنینەوەی شیعر نیە ، کە زیاتر پشت بەبەهرەو سۆز دەبەستێت و، دەشێت هەندێ لە بلیمەتەکان لەتەمەنی مێردمنداڵیدا شیعری زۆر جوان دانێن ، چ جای تەمەنی دوای گەنجیش ، بەڵام تەنانەت شیعرەکانی خەییامیش ناوەڕۆکێکی فەلسەفی قووڵی ئەوتۆیان لەخۆگرتووە کە زادەو هەڵقووڵاوی ئەزموونی دەوڵەمەندی ژیان و رۆشنبیرییەکی قووڵ و فراوانی ئەوتۆن ، کە لەلای گەنجێك پەیدانابێت . ئەمەو خەییام بەدڵنیاییی برادەری قازی ناودار ئیمام ئەبوو نەصر محەمەد عەبدلڕەحیم نەسەوی بووە (کە قوتابی ئیبن سینا بووە) و، زۆر بە رێزەوە لەگەڵ خەییامدا بە چەند بەیتە شیعر دواوەو تکای لێ کردووە وەڵامی چەند پرسیارێکی ئایینی- فەلسەفی بداوەتە ، جا خەییام وەڵامی بە (رسالە فی الکون والتکلیف) لە ساڵی (٤٧٣ ك= ١٠٨٠ ز) داوەتەوەو، تیێدا بەڕاشکاوی وتوویەتی "ئیبن سینای مامۆستام" هەڵبەتە ئیبن سینا لە ساڵی(١٠٣٧ز) دا کۆچی دوایی کردەوە، سا لەگینە مێژووی لەدایکبوونی قوتابییەکەی (واتە عومەر خەییام) لە دەوروبەری ساڵانی (١٠٢١- ١٠٢٣ ز) دا بێت . هەندێك ئەڵێن بەهمەنیاری فەیلەسووف (م: ١٠٦٥ ز) شاگردی ئیبن سینای مامۆستای خەییام بووە ، بۆیە دەپرسم : جا بۆ خەییام نەیگوت :

" بەهمەنیاری مامۆستام"؟

هەر بۆ زانینیش ئێژم ، کە خەییام ناسراوە بەئەمەکداری و، لە نووسین و کتێبەکانیا بە ئەمانەتەوە ناوی ئەو زاناو فەیلەسووفانەی بردووە کە سوودی لێیان وەرگرتووە.

بەم پێودانگە و لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی زۆر، دەتوانم بە کورتی بڵێم مێژووی مردنی عومەر خەییام لە دەوروبەری(٥١٧ك = ١١٢٣ ز) بووە.

ئینجا لێرەدا پێویستە ئیستێك لەسەر هەڤدژی ئەو بۆچوونانە بکرێت کە لەمەڕ مێژووی ژیانی زۆربەی ئەدیبان و زانایان و هزرڤانان هەیە ، کە گەلێکیان هیچ مێژوویەکی لەدایکبوون و مردنیان لە هیچ چاڤکانی و ژێدەرێك تۆمارنەکراوەو، گەلێکیان دوو- سێ مێژووی لەدایکبوون و مردنیان هەیە میناك : مەهستی و بابا ئەفزەڵ ، بۆیە زۆربەی ئەو مێژوویانەم بەم جۆرە تۆمارکردوون (؟...) واتە دەوروبەری ئەو ژمارانەیەو، مەزەندەئامێزە ، یان بە (؟!) واتە مێژووی لەدایکبوون ومردنی نادیارن و، **(ل:)** مێژووی لەدایکبوونە و، **(م:)** مێژووی مردنە.

هەڵبەتە دریغی دەکەوێتە ئەستۆی ئەو مێژوونووسانە کە بەکۆڵ و مشوورخواردنێکی بێ وێنەوە دادەبارینە سەر تۆمارکردنی مێژووی ژیانی خەلیفەو شاو سوڵتان و میرو فەرماندە سوپاییەکان ، تەنانەت مێژووی خەتەنەکردنیشیان فەرامۆش نەدەکرد! بگرە ژمارەی کەنیزەك و خوڵامە خەسێنراوەکان و ئاژەڵەکانیان و کەوچکە زێڕینەکانیان و سەنگ و کێشی تاجە زێڕینە نەخشکراوەکانیان بە گەوهەریش تۆماردەکرد !

سەرباری ئەوەش هێرشی زۆر توندیان دەکردە سەر ناحەزو نەیارانیان و تانەو تەشەریان لێدەدان ، کەچی سەبارەت بەئەدیب و زانا و فەیلەسووف و هونەرمەندان ، دوا کەس بوون ، کە ئاوڕیان لێدەدانەوە ، مەگەر ئەمەیان یان ئەوەیان پەیوەندییەکی

بەتینی لەگەڵ ئەم حوکمڕانە یان ئەو وەزیرەدا هەبایە! خۆ خەییام بەخۆی نموونەیەکـە لەو حاڵەتە ، کەناوی لەگەڵ خاقان شەمسولملووك و سوڵتان مەلیکشـای سـەلجووقیدا هێنراوە ، کە بۆ هەموار کردنی ساڵپێوی ئێرانی و دامەزراندنی روانگەی ئەصـفەهان هێنرابوو، لەسـەر پێشـنیازی وەزیـرە رووناکبیرەکـەی خـۆی نیزامولمـولکی هـاوڕێی خوێندنی سەرەتایی خەییام لە نیشابووردا.

چونکە باوەڕم وایە کە مێژووی ژیانی ناوداران بایەخێکی یەگجار گەورەی هەس لـە دەرخستن و روونکردنەوەی ئەم گۆشە یان ئەو پێچە نادیارەی دیمەنێن مێژوو، بۆیە هەر لەم کتێبەشدا، وەك لە هەموو دانراو وەرگێڕانەکانمدا بایەخی فرەم داوەتێ . ئەگەر ئەم جۆرە بایەخدانە باو بوایە ، ئێستا لە زۆر هەڵەو پەڵەو سەرەگێژێکەو تەنگوچـەڵەمان دەربازدەبووین .

❋

خەییام بۆ ماوەیەکی درێژ بـە ئارامییـەکی بەرچـاو ژیـا لـە سـایەی قەڕاڵسـتانی سەلجووقیداو بەتایبەتی لە پەنای هاوڕێ خەمخۆرە دڵسۆزەکەی نیزامولمـولکی وەزیـری رۆشنهزرو دەستڕۆ و دەسەڵاتداری سەلجووقی . ئەو وەزیرەی کە بـەپێی قسـەی زانـای رووس سمێلجا: "شەیدای هزرۆکەی دەوڵەتێکی هێزدار بوو. بە هەموو شێوەیەك کاری بۆ دامەرزاندنی دەکرد. پێدەچێت باوەڕی وابووبێ کە رۆشنبیریی وزانسـت زەمینـەی چەسـپینی کۆڵەکـەو پایـەکانی قەڕاڵسـتان خۆشـدەکەن ، بۆیـەش بـە چـاولێکەریی ئەندامانی ماڵباتی دێرینی بەتلیمۆس هەولێدەدا زانایـان بێنێتـە ژێـر سـا و پـەنای خۆی" بگرە " بە خۆیشی نووسەر بوو، بە ئەدەبیات نامۆ نـەبوو، کتێبێکـی دانـاوە بەناوی (سیاسەتنامە= ژیان نامەی پاشایان) کە هەمەلایەنی زۆر سوودبەخشە ، وەك

سەر مەشق و رابەر بۆ راهێنانی سـولّتانه کـەم ئەزموونـەکان (........) واش دیـاره داوای له زاناکانی کردبوو، نەمازه له خەییامی هاوڕێی ، که لـەم کـارەدا بەشـداری بکەن" جا چونکه خەییامیش به پێی ئامـاژەی جەمالـەددین عـەلی قفتـی (١١٧٢-١٢٤٨): " باوەڕی بەسیاسەتی مەدەنی لەسەر یاساو رێسـای یونـانی هـەبوو" ببـووه باشترین هاوکاری بەرنامەی نیزامو لمولکی هاوڕێی تەمەنی .

بەو جۆره خەییام له کەش و هەوایەکی لەبار تا رادەیـەکی بەرچـاو، چـالاکییەکانی خۆی نواندو، هەولّ وکۆششه زانستییەکانی بوونه تەواوکەری هـەولّ و کۆششـەکانی زانای گـەوره ئـەبوو رەیحـانی بیروونـی (م: ١٠٤٨ ز) بگـره بەرهەمـەکانی لـه بـواری بیرکاریدا بوونه بناغەی پەرەسەندنی بیرکـاری لـه ئـەوروپای سـەدەی نۆزدەیەمـداو، لەوەیه پێشتریش .

هەندێك له بەرهەمه بەرجەستەکانی بریتی بوون له : دانـانی سیسـتەمێکی نـوێی ژمارەیی بەرینتر له سیستەمه گریکییه باوەکه ، که له مێژ بوو کـاری پـێ دەکـرا، بێجگـه لـه داهێنـانی رێچـکەیەکی گـرنگ بـۆ دەرهێنـانی رەگـی ژمارەکـان و، چارەسەرکردنی کێشەی سێجاکردنی جەبری بۆ یەکەم جار. هەروەها سالّپێوی (زیگـی جـەلالی ، کـه بـەناوی جەلالـەددینی مەلیکشـای سـەلجووقی چـێکرا) خـەییام بەشدارییەکی فرەی تێدا کردبوو، زۆر له سالّپێوی جولیانی وردتر بوو، بگره لـەڕووی وردییەوه زۆر نزیك بوو له سالّپێوی گریکۆری، که تا ئێستا کاری پێ دەکرێت .

خەییام له دامەرزاندنی روانگەی ئەصفەهانیشدا، که ناوی نابوو (مـالّی سـتێران) رۆلّـی بەرجەستەی هەبوو، بەلاّم لەدوای مردنی مەلیکشا ئیتر کـاری پێنـەکرا و، راوڕووتکـەران تالاّن و وێرانیان کرد. ئیـدی بـارودۆخی گشـتی بەرەبـەره کەوتـه شـێوان ، خـەییامیش ماوەیەك پاش کوشـتنی دالّـدەدەرو خەمخۆرەکـەی نیزاملمولـك و، دەرمـان خـواردکردنی

مەلیکشاو، زەبری سەوداکردنی حوکمڕانانی دوای ئەوان ، ناچاربوو ئەصفەهان (پێتەختی سەلجووقییەکان) بەجێبهێڵێت و، بۆ نیشابووری زێدی خۆی بگەڕێتەوەو، بە گۆشەگیری بژێت تا(؟ ١١٢٣ ز) کە کۆچی دوایی کردو، لەوێ بەخاك سپێردرا.

ئیدی گۆڕەکەی چەند سەدەیەك فەرامۆش کرا تا لەسەرەتاکانی سالآنی شەستەکانی سەدەی بیستەمدا، لەساڵی (١٩٦٢ ز) دا بەنەخشەو دیزاینێکی زۆر جوان لە لایەن ئەندازیاری بەتوانا هۆشەنگ سەیحوون (**ل:** ١٩٢٠) مەزارگەیەکی شایستەی خەییام درووستکرا، کە هەموو رەمزەکانی بیرکاری و فەلەك و شیعری تێدا ئاوێتەکرد .

❋

پەیجۆرو پاچڤەوانی لێهاتوو ئەحمەد حامد صەڕڕاف بەزەبری پشکنین و گەڕان و تاوتوێکردنی تێروتەسەلی بارودۆخی مێژوویی سەردەمی خەییام ، گەرچی بەشێوەیەکی نابابەتیانە پشتی بەستووە بە سەرچاوە باوە نەیارەکان دژ بە بزاڤی ئیسماعیلییە ، توانوویەتی دۆخی سەردەمی خەییام بەم جۆرە دەسنیشان بکات : "..لەوەی پێشەوە بۆمان دەرکەوت کە خەڵکی رەشوڕووت نادیار بوونە ، کەچی سوڵتان و میرەکان بایەخیان بەزانست و زانایان داوەو، رەفتاری پیاوانی ئایین خراپ بووە ، خەییام وئیمامی غەززالی ئەم توێژەیە بە شێوەیەکی واقیعی و راستەقینە وەسفکردووە"

سەردەمی خەییام لەباری سیاسییەوە لە کوڵ وجۆشدا بووە ، پڕ بووە لە رووداو قەوماوی گەورە : داڕووخانی دەوڵەتی بوەیهی (٩٣٢- ١٠٥٥ ز)، دامەزراندنی دەوڵەتی سەلجووقی (١٠٣٧- ١١٥٧ ز)، هەڵگیرسانی جەنگی خاچپەرستی (١٠٩٦- ١٢٩١ ز)، بوژانەوەی بزاڤی ئیسماعیلییەی نزاری (١٠٩٠-

١٢٥٦ ز) مینا بزوتنەوەیەکی ئێرانی شۆڕشگێڕانە لە پۆشاکێکی ئایینیدا دژی حکومڕانی خیلافەتی عەبباسی (عەرەبی) و حوکمڕانی سەلجووقیانی (تورکی بێگانە) لەپێناو خۆیبوونی ئێراندا دەخەبتی . جا چونکە بزوتنەوەی ئیسماعیلییە وەك (خوڕەمی) و(سەربەداران) چالاکی خۆی رادەپەڕاند دژی هەردوك دەسەڵاتێن هاوپەیمانی سەلجووقی و عەبباسی ، بەو ئیحتیوبارە کە هەردوك دەسەڵاتی هاوپەیمانی سەلجووقیان و عەبباسیان (سوننی) بوون ، لەلایەن زورناژەنانی پرۆپاگەندەو بانگەشەی عەبباسییان و سەلجووقییان و مێژوونووسانیانەوە ، گەلیك ناوناتۆرەیان لێنرا وەك کافرو خوانەناس و ئیباحییەتخواز و لایەنگری (قرمەتییان) و نۆکەری خیلافەتی فاتمییەکان (٩٠٩-١١٧١ ز) لە میسردا، بگرە ئەفسانەو نەقلٚ و حیکایەتی خورافیانەی ئەوتۆیان سەبارەت بە ئیسماعیلییەکان هۆنیبووەوە ، کە تەنانەت لە نێو ئەوروپاییەکانیشدا بە(حەششاشان) و(پیاوکوژان) ناویان رۆیشتبوو، لە کاتێکا زۆربەی پیاوانی ئایینی خەڵکانێکی مونافیق و واعیزی ماستاوچی سوڵتانان بوون و، لە پشتیوانیکردنی ستەمکاران و سەرکوتکردنی ئازادیخوازانداو، فیقهبازان (بە ئاشکرا چاکەخواز و ژێراوژێر بەدکار بوون) و لە هەمان کاتدا شمشێری کافراندنیان دژی ئەدیبان و هزرڤانانی ئازاد رادەوەشاند و، تەنانەت لە هیچ پیلانێك دژی هاوڕێ بلیمەتە درەوشاوەکانی خۆیانیش نەدەپرینگانەوە ، کار گەییشتبووە رادەیەك کە خەڵکانی وەکو ئیمام ئەبو حامیدی غەززالی ، سڵیان لێدەکردنەوەو خۆیان لە گێچەڵیان دەپاراست ، ئەو غەززالییەی کە دیاردەی زۆربوونی شەرعزانەیلی ساختەی بە مەبەستی سوودی خۆپەرستانە لە

زانستی شەرعدا دەستنیشان کردو، زۆری پێ سەیربوو کە زانستی فیقهـ بەسەر زانستی پزیشکیدا پەسەندتر بێت و، هۆیەکەی دەسنیشانکردبوو، کە :

" پزیشکیی ڕێگە خۆشناکات بۆ گەییشتن بە سەرپەرشتیاری ئەوقاف و سەر وەسیەتی و دەستگرتن بەسەر ماڵی هەتیوان و وەرگرتنی پۆستی دادڤانی و حکومەتی و پێشکەوتن بەسەر هاوتایان و زاڵبوون بەسەر نەیاراندا!"

هەروەها لەنێو سۆفییەکانیشدا خواپەرستانی ریاباز و زۆر کەسی بوودەڵەو، هیچ لەبارا نەبوو، مشەخۆر هەبوون . دەگێڕدرێتەوە کە خەڵکانی ناوداری زۆر گەورەش ، لە شەڕی دەسیسەو پیلان و داوو تێکوفران بێ وەی نەبوون مینا: ئیبن سینا، عەبدوڵا ئەنصاری و شەهرستانی ، کار گەیشتبووە ئەوەی کە (بەناو زانایەك) لە زانایانی تاریکی و واعیزانی سوڵتانان قایل نەبێت کە فیردەوسی مەزن لە گۆرستانی تووسدا بنێژرێت ، بەو بیانووەی کە (قرمتی) و لایەنگری فاتمییەکانی میسرو، دژی خیلافەتی عەبباسییەکان بووە! شایەنی باسە کە خەلیفەی عەبباسییەکان لە ئاخروئۆخری قۆناغی ئاوابوونی دەسەڵاتیاندا مەرایی (شیعە) دەیلەمییەکان وسوڵتانە سەلجووقیەکانیان دەکرد، تەنیا لەبەر ئەوەی لەسەر مینبەران و لەخوتبەکانیاندا ناویان دێنان و ناویان لەسەر دراوان دەنەخشاندن ، ئیدی ئەمەیان بە ئیعترافێکی گەورە بەخیلافەتە رواڵەتییەکەی خۆ دەزانی! کەچی ململانێ و کێشمەکێشان دگەڵ فاتیمییەکانی میسر و ئیسماعیلیەکانی ئێراندا، لە پێناو مانەوەدا بوو. بۆ زانینیش خەییام لە یەکێك لە نامە فەلسەفییەکانیا(ئیسماعیلییەکان) بە عەودالانی حەقیقەتی فەلسەفی دەژمێرێت ، گەرچی هەندێك بەگومانن کە ئەم نامەیە لە دانانی خەییام بێت، بەڵام زۆربەی باسکاران بە کاری خەییامی لەقەڵەم دەدەن ، چونکە خەییام لەژێر کاریگەری بۆچوونە هزرییەکانی(ئیخوانولصەفا)دا بوو، کە ئیسماعیلی بوون و،

قوتابی (ئیبن سینا) ی فەیلەسووفیش بوو، کە باوك وبرایەکی ئیسماعیلی بوونەو، بە خۆیشی مەیلی بۆ ئیسماعیلییە باتِنییەکان هەبووە ، یان لەژێر کاریگەری بۆچوون و هزریاندا بووە.سەرباری ئەوەش برنارد لویس کە لە پەیجۆ بەرجەستەکانی دیرۆك و بیروباوەڕی ئیسماعیلییە ، بەرهەمەکانی مەعەڕڕی و خەییام بە سرووشبارو باندۆرباری ئەدەبیاتی ئیسماعیلی دەزانێت .

بۆ روونکردنەوەی دیمەنی رەوشی سەردەمی خەییام پتر، دەسنیشانکردنەکەی شای شاعیران محەممەد تەقی بەهار(١٨٨٦-١٩٥١) دەخەینە بەرچاو، کە لە پێشەکی پاچڤەی نامەی (نەفس) ی ئەرستۆتالیس لە لایەن بابا ئەفزەڵی کاشانییەوە نووسیویەتی : "...ئازادی ویژدان و هزر کە لە سەدەکانی سێیەم و چوارەمی کۆچیدا لە وڵاتی ئیسلامدا دابین بوو، پاشتر نەمازە لەدوای بەرپابوونی پادشایەتی و زاڵبوونی نەژادانی تۆرانی بەسەر وڵاتی ئیسلامیدا تیاچوو، فەیلەسووفان و هزرڤانانی وەك ئیخوانولصەفا و غەیری ئەوانیش تەنگیان پێهەڵچێنرا..." جا دەرەنجامی پێوارییی ئازادی ویژدان وهزر بووە هۆی مشەختبوون و کوشتن و راودوونانی چەندین فەیلەسووف و هزرڤانی مینا: شێخ شەهابەددینی سوهرەوەردی و عەینولقوزاتی هەمەدانی کە بەم پارچە شیعرە گوزارشتی لەو رەوشە نالەبارە کردووە: **" الهی راست گویم، فتنه از توست**

**ولی از ترس نتوانم چخیدن**

**لب و دندان تُرکان خطارا**

**بدین خوبی نبایست آفریدن**

**که از دست و لب و دندان ایشان**

**به دندان دست و لب باید گزیدن"**

**واته :**

"خودایه راست بلّێم ، لەتۆیە بشێوی
وەلێ ناتوانم بدوێم لە ترسان
لێوو دگانێن تورکانی کەچڕەوان
نەدەبوایە بەم چاکییە بئافرێنی
کە لە دەست و لێوو دگانیان
دەبێ دەست ولێومان بگەزین بە دگان !"

جا (بەهار) پێی وایە ئەو رەوشە نالەبارە پاشتر بووە هۆی زاوزوێی ئەو دە- دوازدە چوارینەی رەسەنی خەییام، واتە خەڵکانێکی دی چوارینەیان هەڵدەبەست و دەیاندایەپاڵ ئەو، بەمە لە هەر مەترسییەك دەخەلەسین و وەك بەرزەکی بانان بۆی دەردەچوون.

هەژی ئاماژەیە کە خەییام بە خۆیشی لە پارچە شیعرێکی عەرەبیدا ئاماژە بۆ بوغرایی تورکان دەکا :

**"... بۆیەش دەوڵەتی بەدخوا درێژەیکێشاوە**

**(تورکزادەکان) توان هەڵزنێنە کەشکەڵانی ئاسمانی خوداوە !"**

ئاری...رۆژگاری خەییام رۆژگارێك بووە کە " زۆرینەی مەردم روویان لە ئۆلی حەق وەگێڕاوە ، بازێڕی پەندیاریی بێ باو بووەو، گێوڵی شەریعەتمەداران گەندەڵ بووە" بە گوتەی ناصر خوسرەو.

سەدەی پێنجەمی کۆچی (١١ ز)، واتە ئەو سەدەیە کە خەییام تێیدا ژیاوە ، گەرچی بە سەدەیەی ئاژاوەو بشێوی سیاسی و جڤاکی ناوی وەرگرتبوو، بەڵام لە مێژووی هزریندا سەدەیەکی درەوشاوە بوو، سەدەیەکە کە " بە تەحقیقاتی فراوان و رەخنەئامێزی ئەبوولرەیحانی بیروونی و هۆزانی دڵکێش و پڕ هەستی ئەبوو عەلای مەعەرڕی دەستپێکردووەو، بە فەلسەفەی گومانئامێزی ماتماتیکزانی ناڤدار عومەر خەییام کۆتایی هاتووە" بە قسەی مارشاڵ هاجسن ، واتە بارودۆخی کەلتووری تا ڕادەیەك گەشاوە بووە ، ئیدی ئەمە سروشتی نەشونماو پەرەسەندنی کەلتوورە ، کە لە هەر شوێنێك کێشمانکێشی هەڤدژەکان گەرم بێت کەلتوور گەشەدەکاو، ئەگەر گەرمی کێشمانکێش دامرکێت ، گەشبوونی کەلتووری دادەمرکێتەوە و سست وخاودەبێتەوە . جا لە و رۆژگارەدا پتر لە سەدو هەشتا شاعیر، نووسەر، زمانەوان ، مێژوونووس ، جوگریافیازان ، نووسەرو دانەر لەبوارێن سیاسەت و کارگێڕی و پزیشکایەتی ، ژیاننامەنووسی هەمە جۆر، هەڵکەوتبوون و ناویان دەرکردبوو.

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بۆ قوتابخانە (نیزامییەکان) بکرێ کە نیزامولمولکی وەزیری ڕووناکبیری سەلجووقی لە ئەصفەهان ، نیشابوور، بەلخ و بەغدا دامەزراندبوون و بودجەیەکی ساڵانەی (٦٠٠,٠٠٠ هەزار دیناری بۆ تەرخانکردبوون .

ئەمانەش لە شاعیرە عەرەبی زمانە بەرجەستەکانی سەردەمی خەییامن : ئەبو موزەفەری ئەبیۆردی (م : ١١١٣ ز) ئیسماعیل تەغرائی (م : ١١١٩)، عەلی باخەرزی (م : ١٠٧٥) ئیبن شبلی بەغدادی (م: ١٠٨٠)

لە نووسەرە بەناوبانگەکانیش : ئەبولقاسم عەلی حەریری (١٠٥٤- ١١٢٢). بەرجەستەترین شاعیرانی فارسی زمانیش ئەمانە بوون : قەتران تەبریزی (؟ ١٠٠٩- ١٠٧٢) ، موعززی نیشابووری (١٠٤٨- ١١٢٧) ، سەنائی غەزنەوی (م :؟ ١١٤٥)،

مەسعوود سەعەد سـەلمان (١٠٤٦- ١١٢١)، عوسـمان موختـار ی (م :؟ ١١١٨)، ئـەبو مەعالی رازی (م : ١١٤٦)، رەشیدی سەمەرقەندی (نیوەی دووەمی سەدەی ١١ و نیوەی یەکەمی سەدەی ١٢ ز) و لامیعی دهستانی (؟!).

ئەمانەش دیارترین هزرڤان و فەیلەسـووف و زانایـانی هاوچـەرخی خـەییام بـوون : ئیمـام مووەففـەقی نیشـابووری (؟!) ، عوسـمان جـەلالی هـەجویری (م : ١٠٧٢)، ئەبوولفەزڵ بەیهەقی (م : ١٠٧٧)، ئەبولمـەعالی ئیمامولحـەرەمین (م : ١٠٨٥)، **محەممـەد محەممـەد** حوسـەین بەغـدادی (١٠١٤- ١٠٨٧)، ئەبوحاتـەم ئیسـفیزاری (م :؟ ١١٢١)، مەیموون نەجیب واستی (م : ؟ ١١٢٠)، **محەممەد** مەعموور بەیهەقی (م : ١٠٩٢)، ئیمـام ئـەبو حامـد غـەززالی (١٠٥٨- ١١١١)، ئەبولحەفصـی نەسـەفی (م : ١١٢٤)، ئیمـام ئەبولحەسەن عەبدولغـەففار نیشـابووری (١٠٥٩- ١١٣٤)، **محەممـەد** کـوڕی بەهائـەددین خەرەقی (م : ١١٣٨ ز)، ئەبولقاسم هەیبەتولڵا ئیستڕلابی (م : ١١٣٩)، یووسف کـوڕی ئەییووب زاهیـد (م : ١١٤٠)، ئەبولقاسـم زەمەخشـەری (١٠٧٥- ١١٤٤)، ئەبوولفـەتح **محەممەد** شەهرستانی (١٠٨٦- ١١٥٣) و عەبدوڕڕەحمان خازنی...

هەڵبەتە عەینولقوزاتی هەمەدانی (١٠٩٦- ١١٣٠) و عـەرووزی سـەمەرقەندی (م : ١١٧٤) و عەبدوڕڕەحمانی خازنی (م : ؟ ١١٥٥) لە شاگردە بەرزو دیارەکانی خـەییامن. لەوەیشە عەرووزی دێرینترین کەسێك بێت کە بەفارسی باسـی خـەییامی کردبێـت . هەروەها کەسانێکی دیکەش باسیانکردووە لەوانە : نەجمەددین ئـەبو بـەکر رازی (م : ١٢٤٧) کە بەم جۆرە وەسفی خەییامی کردووە : "...بـەری تێـڕوانین ئیمانـە و بـەری رەفتار عیرفانە ، کەچی بێچارە فەلسەفی و گومڕا و سرووشتڕەوان کە لەم دوو پلەوپایە حایرو وێڵن ، یەکێك لە زاناکانیان کە بە زانست و حیکمەت و ئاوەزمەنـدی و زانـین

ناڤدارەو ئەوە عومەری خەییامە، بە ئەوپەڕی دۆشداماوی لە ونبوونی گومڕاییدا کوێرایی خۆی بەم شیعرە دەربڕیوە:......"

نەك هەر ئەوەندە ، بگرە هەندێك لە توندڕەوان مەحكوومیان دەكردو، دەیانبوغزاند و گەلەكۆمەیان لێدەكردو، بە زەندیق تۆمەتبار یان دەكرد، كار گەییە ئەوەی خەییام لە ژیانی خۆی بترسێت و، زمان و قەڵەمەكەی خۆی لەغاو بكا، (قفتی) گوتەنی : " بەمەبەستی خۆپاراستن، نەك دینداری چووە حەجێ " و دەڵێن بۆ ماوەیەكی نادیار لە بەغدا ئاكنجی ببوو.

ئەوەی مایەی سەرنجە باسكاران و توێژەران و زانایانی كۆنی ئێرانی و عەرەب ، هەڵوێستی سەیرو هەڤدژیان سەبارەت بە خەییام هەبووە ، هەمیشە ستایشی خەییامی زانایان كردووە ، بەلاَم خەییامی شاعیریان نەك هەر فەرامۆشكردووە ، بەڵكو هێرشیان كردووەتە سەری و شیعرەكانیان بەماری ژەهردار زانیوە ! ئەگەرچی هەندێ لە سۆفیانی دوایی ستایشی شیعرەكانیان كردووەو لە كۆڕی خۆیاندا بەكاریان هێناوە . لە حاڵێكا ئەحمەد رامی شاعیر گوتەنی:

**"خەییام بە زەبری شیعرەكانی تاكو ئێستا زیندووە"!**

❋

میناك هەر پیاوێكی مەزنی خودان كەسایەتییەكی كارێزمی ، گەلێك حیكایەتی ئەفسانەیی، لەدەوری خەییام تەنراوە ، چ لەلایەن دۆستانیەوەو، چ لەلایەن ناحەزانیەوە ، هەڵبەتە ئەوانەی خۆشیان ویستووە خەرمانەیەكی پیرۆزیی رەهایان لەدەوری چێكردووەو، ناحەزەكانی بەر قەمچی نەفرەتیان داوە ، ئیدی بە دەگمەن یەكێك هەڵكەوتووە بە ئینسافێكی حەقیقەتخوازی بابەتیانە باسی كردبێت...خۆ

ئەگەر بەوردی لەو قسانەی قازی یووسف قفتی (١١٧٢- ١٢٤٨) رابمێنین کە لە(مێژووی حەکیمان) دا دەربارەی خەییام کردوونی ، بۆمان دەردەکەوی کە چ هەڤدژییەکی لەمەڕ هەڵسەنگاندنی خەییامدا کردووە ، چ نەهەقییەك لەلایەن مێژوونووسێکەوە کراوە ، کە دەبوایە بابەتگەراو بێ لایەن بوایە :

" پێشەنگ و ئیمامی خۆراسان و دانای رۆژگارە . زانستی یۆنان دەزانێت و دەیلێتەوە . خەڵکی بۆ یەکتاپەرەستی و دینداری هاندەدا، بە پاکژکردنەوەی جموجوولی لەش بۆ پاکژبوونەوەی دەروونی مرۆڤانیانە . پابەندی سیاسەتی مەدەنییە لەسەر یاساوڕێسای یۆنانی بوو. سۆفیانی ئەم دواییە هەندێ لە رواڵەتێن شیعرەکانی پەسەند کردن و، گواستیانەوە نێو تەریقەتەکەی خۆیان و، لە کۆڕو خەلۆەتەکانی خۆیاندا باسیان دەکرد، کەچی لەناخدا مارێن گەزندەی شەریعەتە و مایەی کۆت و بەندی باوەڕە! کاتێك خەڵکانی زەمانی وی کەوتنە تانەو تەشەر لە دینی و، نهێنییەکانیان ئاشکرا کرد ، لە خوێنرشتنی خۆی ترساو، جڵەوی زمان و قەڵەمەکەی گرت و، بەمەبەستی خۆپاراستن ، نەك دینداری ، چووە حەجێ . بەڵام هەندێ نهێنی ناخی ناپاکژی دەربڕی . کاتێکیش گەییشتە بەغدا، هەندێ لەپەیڕەوانی لەزانستیی کۆندا، ویستیان بیبینن ، لێ پەشیمان ئاسا ، نەك وەك هاودەمێك ، دەرگای لەڕوو داخستن . کە لە حەجیش گەڕایەوە بۆ وڵاتی خۆی ، دەچووە پەرستگە و، هێشتا هەر نهێنییەکانی دەشاردەوە ، ئەو نهێنییانە کە هەر دەبوایە ئاشکرا بن .

لە زانستیی ئەستێرەناسی و پەندیارییدا بێ هاوتا بوو، لەم بوارانەدا بە نموونە ناوی دەهێنرایەوە ، گەر پاك وبێ گەرد بوایە !..."

نەهەقی سەبارەت بەخەییام گەییە رادەیەك زێدەباری هەندێ لە بێگانان ، هەندێ لە توێژەرانی هاونەژادی ئێرانی خۆیشی نکۆڵی لە شاعیرییەتی بکەن ، بەڵێ هەندێ

کەس بە گومانن لەوەی کە خەییامی زاناو فەیلەسووف خودانی ئەو چـوارینانە بێـت کە دراونەتە پاڵی و، وەکو چۆن هەمان گومان لە کەڵە شاعیران هـۆمیرۆس (سـەدەی نۆیەمی پێش زایینی) و شەکسپیر کراوە!

ئەمەش زادەی هەبوونی چـەند شـاعیرێکی دیکـەی بچـووك و گومنـاو بـەنازناوی (خەییام ، یان خەییامی) یەوە: عەبدوڵڵا خەییامی مازەندەرانی (م: ۳۱۰ ك = ۹۲۲ ز) ، ئەبوو صالح خەییامی بوخاری (م : ۳٦۱ ك = ۹۷۱ ز)، خەڵەف **محەممـەد** ئیسـماعیل خەییام (م : لەسەدەی پێنجەمی ك = ۱۱ ز)، مەزهەبوددین **محەمەد** عـەلی خـەییامی (م : ٦٤۲ ك = ۱۲٤٤ ز) و عەلائـەددین عـەلی **محەمـەد** ئەحمـەد خەڵـەف خـەییامی خۆراسانی (م : پێش سەدەی هەشتەمی کۆچی= ١٤ ز)

هەڵبەتە بەهۆی لێکچوونی نازناوەکانیانەوە لەگینە هەندێ چـوارینەیان درابێتـەپاڵ عومەر خەییام و، هەڵبەتە پێچەوانەکەشـی دروسـتە ، چـونکە ژمارەیـەکی زۆر لـە سەرچاوەی باوەڕپێکراوی بەئیحتوبار ناوی (عومەر ئبراهیم خەییام) یان لەگەڵ دەیـان چـوارینە و چـەندین پارچـە شـیعر بەهـەردوك زمـانێن عـەرەبی وفارسـی بـردووەو تۆمارکردووە ، کەچی هاونازناوانی خەییام ، شتێکی ئەوتۆیان نیە ، بگرە لە ئاسـتی رۆشنبیریی فرەلایەنی عومەر خەییامدا نەبوونە ، تەنانەت شیعرەکانیان ئاسایی بووەو چوارینەشیان کەم بووەو، نە لە رووی فۆرم و، نە لە باری ناڤەرۆك و ماناوە لەئاسـتی چوارینە رەسەنەکانی عومەر خەییامدا نین و، زێدەباری گەڕان و پشکنینی زۆرم هیچ ئاماژەیەکم بەرچـاو نەکـەوت ، کـە چـوارینەیەکی رەسـەن یـان نارەسـەنی خـەییام درابێتـەپاڵ یـەکێك لەوانـە ، کەچـی بـە پێچەوانەشـەوە دەیـان چـوارینەی رەسـەن ونارەسەنی خەییام دراونەتەپاڵی شاعیرانی دیکەی گەورە ونـاودارو، پەپێچـەوانەش .

هۆیەکەشی ئەوەیە کە باشترین شاعیر لە هاونازناوەکانی خەییام ناگاتە ئاستی شاعیرێکی پلە چواری ئەدەبیاتی ئێرانی .

*

هەموو سەرچاوەکان وێڕای بەرهەمەکانی خەییام خۆی، ئەوە نیشاندەدەن کە بلیمەتێکی بەهرەمەندی مەزن و خودان ئاوەزێکی روون و رۆشنبیرییەکی ئینسکلۆپیدیایی سەیر بووە. زۆر حیکایەتی سەیرو خۆش لەمەڕ جیلۆەی بلیمەتی و پێشبینییە پاراسایکۆلۆژییەکانی هەن وەك: **" گۆڕەکەم دەکەوێتە شوێنێك کە هەموو بەهارێك دەبێ بە گوڵستان"** و زۆر شتی تری لەم بابەتە کە لەم تەنگەبەرەدا نایەتە گێڕانەوە.

دەتوانین لەو پەیڤانە کە هاوچەرخانی خەییام دەربارەیان گوتووە ، خەسڵەتەکانی کەسایەتی خۆی و تایبەتمەنییە ئەدەبی و هزرییەکانی هەڵێنجین ، کە پێچەوانەی بۆچوونی هەندێك لە شرۆڤەکارانی چوارینەکانی دەسەلمێنێت ، کە گوایە هێماگەرایەکی سۆفی بووە . نەخێر فەیلەسووفێکی بوونگەرای ئایینـدار (وجوودی ئیماندار) بووەو، چەند سەدەیەك پێش فەیلەسووفەوجوودییەکانی ئەوروپا کەوتووە مینـاك : کیرگەگاردی دانیمارکی (١٨١٣- ١٨٥٥)، میگێل ئونامونۆی ئیسپانی (١٨٦٤- ١٩٣٦) و گابریێل مارسێل فەرەنسی (١٨٨٩- ١٩٧٣) و ئاستی گەییوەتە سنوورێك ، کە ئەرنیست رینان (١٨٢٣- ١٨٩٢) هزرڤان و مێژوونووسی بەنێوبانگی فەرەنسی بپرسێ :

**" ئەرێ سەیر نیە لەسەدەی یازدەمینی زایینیدا، لەئێرانـدا شـاعیرێکی هاوتـای گوێتەو هنریش هاینە پەیدا ببێ ؟!"**

ڕەنگە وەڵامی تەواو و قەناعەتبەخشی ئەم پرسیارە لەلای مامۆسـتا(ئەدیب تـەقی) بێت، کە لە پێشەکی پاچڤەکەی (نەجەفی) دا ئەڵێ : " هەر هەموو ئەو مانایانـەی کە شیعری خەییام بەدەوریا دەسووڕێتەوە لەم نیودێڕە عەرەبییەدا خەسـت دەبێتـەوە: (دەرفەتی نێوان هەردوو نیستی بقۆسنەوە)" واتە خەییام تا رادەیەکی زەق ئەبیکۆری مەزهەبە ، هەڵبەتە بەپشتیوانی گەلێك لە چوارینە نارەسەنەکان!

پێدەچێ ئەم ریبازەی خەییامە ئەوروپاییەکانی ئەفسوون کردبێ ، بە تایبەتی گەلێك لە شاعیرەکانیان ، لەوانە (لۆرکا) یە ، کـە خۆسـێ میگێـل پێشـوەخت کاریگـەری چوارینەکانی خەییامی بەسەرەوە کەشف کردووەو، وتوویەتی : " چونکە هەڵوێستی و جوودیانەی خەییام ، بە هەموو سادەیی و قووڵییەکەیـەوە ، پێچـەوانەی دابونـەریتی مەسیحییە ، کە خوازیاری دەستبەرداربوونی لەزەتە بەدەنییەکانە ، وەکـو دزێـوترین گوناه و ملدان بۆ دانپیانان و، چاوەڕوانی هاتنی ژیانێکی تر لە پاش مردندا" کەچی خەییام لە چوارینەکانیدا بە گوێرەی خوێندنەوەو ئەنجامیگری دکتۆر محەممەد غونـەیمی هیلال (١٩١٦- ١٩٦٨) وادیارە " بانگەواز بۆ لەزەتخوازی دەکا، بەڵام لەپشت کەڵکەڵە هەڵایساوەکانیەوە ، خەمی هزرڤان و کزەی داخداران و ناسکی هۆشی دەستەوەسـتان لە هەمبەر نهێنییەکانی ژیان ، تا رادەی قەڵسبوون و بێزاری لە رووبینان و دەڵەچـەو و هەلپەرستان و فیشاڵبازانی ئایینی" هەروەها "خەییام لە هەندێ چـوارینەدا مینـا خودان باوەڕی تایبەتی سـەبارەت بـە رۆح ، سەرسـامی و دۆشـداماوی لـە هەمبـەر نهێنییەکانی گەردوون و، بە گومان لەزیندووبوونەوەو ژیانیکی تر " دێتە بەرچاو.

ئا بەم جۆرە چوارینەکانی خەییام بەدەوری تەوەری تێهزرین لە کورتی تەمەن و حەتمییەتی نەمان و دۆشداماوی میتافیزیکیدا دەخولێنەوەو، لە هەندێ لەچوارینەکانیدا خەییام " قەڵسە لە دەستەوەسانی ئاوەزمەندان لەهەمبەر نهێنییەکان وەك چۆن لە فیشاڵبازانی ئایینی هاوچەرخانی خۆی بێزارە..ئەمەش لەدیمەنەکانی رەهەندی کۆمەڵایەتی چوارینەکانیەتی" ئەمەش مامۆستا هیلال گوتەنی ، سا بۆیە هیچ سەیر نیە بە پێی قسەی قەهرەمان سلێمانی (نوێنەری کەلتووری ئێرانی لەتاجیکستان) دا لە کۆڕی رۆژی خەییامدا لە ساڵی ٢٠٠٥دا " هزرو بۆچوونەکانی خەییام لە ناخودئاگاو نەستی دەستەجەمی رۆژئاواییەکاندا نیشتۆتەوە و رەنگی داوەتەوە"

جا هەر لێرەدا پوختەترین و گەشترین پێناسەی خەییام لەلایەن شاعیری سووری بەندەر عەبدلحەمید(**ل:** ١٩٤٧) دێنینەوە کە لە تاقە رستەیەکدا چڕیکردۆتەوە: **"شاعیرێکە ژیانی لەسەر زەمین بێدارکردۆتەوە"** و بە ناوەڕۆکی چوارینە **" حیکمەت ئامێزەکانی کە بانگەوازی مومارەسەی ژیانی بەخۆشی و ئازایەتی و جوانی و ئاسوودەیی هەڵدا، بۆیەش تەنانەت ئەوانەی کە هیچ پەیوەندییەکیان بەخوێندەوەوە نەبوو، روویان کردە خوێندنەوەی !"**

لێرەشدا دروستی گوتەی شاعیر ولیەم بەتلەر ییتس (١٨٦٥-١٩٣٩) بەدیاردەکەوی : **" ئەو کاتە دەست بە مومارەسەی ژیان دەکەین ، کە لە قاڵبی تراژیدیادا وێنای دەکەین"**

ئاری خەییام زۆر باسی مەرگ دەکا، بەڵام نەك لە دیدگەی نیهلیستییەوە "ئامادەڤانی مەرگ لە هۆزانی خەییامدا پەسنی ژیانە" بە گوزارشتی خەییامناسی توانا محەمەد رەزا قەنبەری (**ل** : ١٩٥٥) هەر لێرەشدا ئاکامی رەشبینیی خەییام

بەراوردانە لەگەڵ ئاکامی رەشبینی مەعەڕڕی هاوتایدا دەرکدەکەین و، دکتۆر غونەیمی هیلال جەخت لەسەر ئەم بۆچوونە دەکا : " ئەم جۆرە تێڕامانانە لە سووڕانەوەو تێپەڕبوونی رۆژگارو نەماندا خەییام و مەعەڕڕی لە تێڕامانی فەلسەفیدا لێکدی نزیکدەکاتەوە ، هەرچەندە هەریەکەیان گەییوەتە ئەنجامێکی پێچەوانەو دژی ئەنجامی ئەویتر، گەرچی هاوپێشەکی و پێشزەمینەن لە سەرەتادا و، زێدەباری قەڵسی و بێزاری هەردوکیان لەبوون و خەڵکی ، دوور نیە کە دیدارێکی مێژوویی لە نێوانیاندا روویدابێت "

لێرەشدا جێی خۆیەتی هەڵسەنگاندنی هزرڤانی پێشکەوتووخوازی گەورە **هادی لعەلەوی** (١٩٣٣- ١٩٩٨) سەبارت بە مەعەڕری بێنمەوە، کە تاڕادەیەکی بەرچاو خەییامیش دەگرێتەوە :

**" دەشێ رۆشنهزری گەردوونیی لە مەردم دوورەپەرێز ببێ ، بەڵام هەرگیز لێیان دانابڕێ و، کونجگیرییەکەی لە گۆشەی شێوەگەلێکی حیادی یا سیلبی دەردەکەوێ ، کە رۆشنهزر لە دەرەوەی هێڵی رووداوە جڤاکی و سیاسییەکان رادەوەستێ ، کەچی لەو کونجگیرییەی بایەخدانی بە مەردم بەردەوامەو، منەی چارەسەری بۆ وێمەکانیان دەکا، کە کۆششی جار جار هاوتەریبی بایەخدانیەتی بە هەستیی پەتی..."** ئاری **"رۆشنهزری گەردوونی لە کونجگیریدا وێنەی جڤاتی خۆی هەڵدەگرێ و، پـژگاڵی دۆزینەوەی هزرۆکانێك دەبێ ، کە لە گۆڕانکاری و پێشخستنیدا، یان راستکردنەوەی کەچرەوییەکانیدا بەشداربێ "**

خەییام بەجورئەتێکی دەگمەنەوە لەبوون وگەردوون و لە مەتەڵ و نهێنی ژیان و مردن تێڕاماوەو، دەرك و تێگەیشتنی زووبەزووی خۆی لەو خولیاو خەیاڵ و گومان و هزرانەی کە دواتر لەسەردەمی رۆشنگەری ومۆدێرینتەدا (لە سەدەی نۆزدەیەمی

زاییینیدا) یەکانگیری مرۆڤــ بوونەوە ، بە راشکاوییەکی سەیری ئەوتۆوە دەریبڕیــوە ، کە لە شاعیرانی تری جیاکردۆتەوە ، هاتووە بۆ ئەو مەبەستە قالْبی چــوارینەی ، کــە تێیدا مامۆســتا بــووە ، هەڵبــژاردووەو، توانیویــەتی لــەو رێگەیــەوە بــە سخوچــڕی گوزارشت لە گوتاری شیعری و هزری خــۆی بکــات و، وەرگــر بەئاســانی پێشــوازیی لێبکات..

ئەوە بوو چوارینەکانی بلەز و بە فراوانی تەنانەت لــە نــاو "میللــەتانی بێگانــەدا، بێگانە لەرووی نیشتیمان و رەگەزو زمان و ئاییینەوە..." بلاوبــۆوەو، بگــرە کەوتنــە سەر زاری مەردمی رەمەکیش ، بەتایبەتی لەبەر ئەوەی باسی ئەو شتانە دەکــەن کــە زەینی بەشەریان لە هــەموو کــات و شــوێنێکدا نیگــەران و زڕخەودەکــەن مینــاك : دۆشداماوی لە هەمبەر نهێنییەکانی گــەردوون و رۆح و هــەبوون و نــەمان و کــورتی تەمەن و بەڵاو کارەساتەکانی ئەم دنیایــە و مەســەلەی ژیــان و مــردن و چارەنووســی جەستە لەپاش مردن...زێدەباری ئەوەی هەندێك لــە چــوارینەکانی خــەییام رەخنــە و ئیرادی توندیان تێدایە دژی نەخۆشییەکانی کۆمەلگا و ریابازان و هەلپەرستان و ئــەو فیشالْبازانەی کەخۆیان لەژێر پەردەی زانایی و خواناسیدا دەشێرنەوە.

ئەمە و جگە لەوەی هەندێ لە چوارینەکان پڕن لە گلەیی و گازندەی توند لە رۆژگار و فەلەك و چارەنووس ، واتە بە پێچــەوانەی دیباجــە ئاســاییەکانی نامــە زانســتی و فەلسەفییەکانی !

خــەییام بــە پاشــینەی ئــیبن ســینای مامۆســتای نــاوی دەرکــردووەو، مینــاك مامۆستاکەی فەیلەسووف و وێژەڤان و پزیشك و شاعیر بووە ، بگرە بیرکاریڤان و ئەستێرەناسیش بووە . ئینجــا خــەییام بەهــەموو بوونیــەوە ئــاوەزێکی گــەورەی زەبرمەند بوو، کە بێ وچان لە تێهزرین و گوماندارییدا عەودالْی هەق و هەقیقەت

بوو، هەروەها دڵێکی ناسك و هەستیاری لێوڕێژ لە جوامێریترین هەست و سۆزی مرۆڤایەتی بوو، زاتێکی هەستیاری نەفس بەرز بووەو خۆی لە ملکەچی و سەرشۆڕی و خۆپەرستی و رووبینی و حەسوودی و بوغزو تەماحکاری و چاوچنۆکی و ئاڵچاغی دوورگرتووە، کە لەو سیفەتە هەرە نزم و دزێوانەن کە خەییام لە زۆربەی نامە و چوارینەکانیا لەقاوی داون .

لێرەشدا جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەو لێکچوونە گەورەیە لە میزاج و هزردا بکرێت کە خەییام دگەڵ ئەبوو عەلای مەعەڕڕی (٩٧٣- ١٠٥٧ ز) کۆدەکاتەوە . ئەو مەعەڕڕییەی کە شیعری فەلسەفیی لە ئەدەبیاتی عەرەبدا داهێناوە، بێگومان خەییام لە کاریگەری ئەو بەدەر نەبووەو، پوختەی هزریی گەلێك لە چوارینەکانی لە چامەکەی مەعەڕڕیدا دەبینین کە بەم نیو بەیتە دەست پێدەکات:

**" غيرُ مجدٍ في ملّتي و اعتقادي..."**

**واتە :**

" بێ سوودە لە بیرو باوەڕما"

هەڵبەتە ئەم جووتە رەبەنە تا مردن ، کە هیچ باسکارێك نیە زەوجینی خەییامی بە بەڵگە سەلماندبێت ، جگەلە تاقە ئاماژەیەك کە گوایە خەییام خەتنێکی (زاوایەکی) هەبووە بەنێوی ئیمام محەممەد بەغدادی (ختن = خەتەن= زاوا: مێردی کچ و مێردی خوشك دەگرێتەوە) بەڵام لەگینە ئیمام بغدادی مێردی خوشکی خەییام بووبێت . پێشم سەیرە کە دکتۆر بەدر تەوفیق (؟!) بە متمانەیەکی تەواوەوە باسی (یاسەمین) ناوێك دەکا، کە گوایە دڵبەرو ژنی خەییام بووەو زوو مردووە ، جا نازانم ئەم زانیارییەی لە چ سەرچاوەیەکەوە وەرگرتووە ، چونکە لە دەیان سەرچاوەی گرنگدا بۆی گەڕام کەچی نەمدۆزییەوە!

کەواتە ڕەبەنایەتی کاری لە کەسایەتی و ئەدەبی مەعەڕڕی و خەییام کردووە ، بەڵام ئەوەی جیایان دەکاتەوە زوهدو دنیانەویستی و نەهلیستیەتی زاڵـی مەعـەڕڕی بـوو. لێرەشدا جێی خۆیەتی رای ئیبنولجەوزی (م: ١٢٠١ دەربارەی (مەعەڕڕی) بگێڕینـەوە ، کە تا ڕادەیەك خەییامیش دەگرێتەوە : **" ئەبو عەلا لە ڕواڵەتدا کافر دیارە ، کەچی لە ناخەوە موسڵمانێکی باوەڕدارە ، بە پێچەوانەی موناقیقەکان "**

بەڵێ.. بەڵگەی زۆر دەربارەی ئیمانداری خەییام هەیە، چ لە سیپارەو نامە فەلسەفی و زانستییەکانی و، چ لـە حیکایەتـە گێڕدراوەکـان لـە لایـەنی هاوچـەرخەکانیەوە ، نەمازە شارەزایی لە شرۆڤەی قورئاندا، بگرە ڕەوش و پەیڤینی پـێش مردنـی مینـاك ئەوەی (بەیهەقی) لە(پاشماوەی حیکمـەت پـارێزان) دا دەیگێڕێتـەوە: **" خوایـە وەك دەزانی کە بەندە بە گوێرەی توانام تۆم ناسیوە، جا لێم ببوورەو ببەخشـە، چـونکە زانینی تۆم بەلاوە ناوکۆمە بۆت"** هەروەها مەولانا خوسرەوی ئەبرقووهی لە کتـێبی (فیردەوسی مێژووەکان)دا باسی خەییام زۆر بە چاکە دەکاو لە کۆتاییدا ئێژێ :

" ئەڵێن ئەمە دوا شیعری خەییامە کە وتوویەتی :

**سیر آمدم ای خدا از هسـتی خویـش**
**از تنگ دلی و از تهی دستی خویش**
**از نیسـت چو هسـت کنی بیـرون آر**
**زین نیستیم بحرمـت هسـتی خویش**

**واتە:**

خودایە یەکجار بێـزارم لە هەستیم
لە دڵتەنگی و هەژاری و کەسـاسیم
چکو هەستی لە نیستی دەئافرێـنیٚ

وادیارە رۆژاوایییەکان لێکچوونێکی زۆریان لەبارەی بەهرەو میــزاج و خــوو هــزرو فرەلایەنی داهێنانەوە، لــەنێوان خــەییام و هەنــدێ لــەزاناو فەیلەســووف و ئــەدیب و هونەرمەندەکانی خۆیانــدا بینیــوە وەك : لــەیۆناردۆ داڤنشــی (١٤٥٢- ١٥١٩) گــالیلۆ گـــــالیلی (١٥٦٤- ١٦٤٢)، ڤـــــۆلتێر (١٦٩٤- ١٧٧٨)، بـــــایرۆن (١٧٨٨- ١٨٢٤) و شۆبنهاوەر(١٧٨٨- ١٨٦٠) بۆیە هیچ سەیر نیە کە لە ســاڵی ١٨٩٢دا (یانــەی عومــەری خەییام) لە ئینگلستان دامەزرێ و پاشان لە ئەمریکادا لە ساڵی ١٩٠٠ دا دامــەزرێ و بایەخێکی فراوان بە چوارینەکانی بدرێ و، ناو و ناوبانگیشــی پەتائاســا لەئــەوروپاو ئەمریکادا بڵاوببێتەوە ! کەچی خەییام لە ئێراندا وەکو شاعیر لەبازنەیــەکی تەنگــدا ناسرابوو، بۆیەش " دوو خــەییام هاتنــە ئــاراوە : یــەکێکیان خــەییامی شــاعیر لــە رۆژئاوادا، ئەویتریان وەکو زانای بیرکاری و گەردوون و فەیلەسووف لەرۆژهەڵاتدا. جــا رۆژئاوا رۆژاوایە و رۆژهەڵات رۆژهەڵاتە ! " بە گوزارشتی (ف.سمێلجا) ی پرۆفیسۆری فیزیاو ماتماتیك .

هەڵبەتە لەگەڵ ئەوەشدا زۆری پێنەچوو هەردوك رۆژئــاواو رۆژهــەڵات لــەژێر بــاڵی ئەفسووناوی چوارینەکانی خەییامدا یەکیان گرتەوە !

❋

شۆرەتی دێرینی خەییام دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی کــە زانایــەکی خــودان دانــراوێن زانســتی و فەلسەفی گرنگ و کاریگەر بــووە ، ئــیبن خەلــدوون (١٣٣٣- ١٣٧٨) بــە "مــەزنترین زانــای

بیرکاری رۆژهەڵات " ی وەسفکردووە ، بگرە خەییام بەو نامەیەیی کە دەربارەی (جەبرو موقابەلە) ی نووسیوە پێش دیکارت (١٥٩٠- ١٦٥٠) ی فەیلەسووف کەوتووە! بەڵام وەکو شاعیرێکی بەرجەستە و زێدە کاریگەر لە پاش مردنی بە حەوت سەدەو نیو ئەوجا کەشف کراو ناسرا! کەچی ئەو خەییامەی کە بەسەدان ساڵ دوای مردنی ئەم شۆرەت و نێوبانگە گەورەیەی پەیداکرد، لەوە دەچێ کە خۆی بەشاعیرێکی پیشەڤان نەزانیبێ و، ئەوەی بۆی هاتبێت بۆ سەرگەرمی خودی خۆی و حەسانەوە لە شەکەتی کار و رەواندنەوەی خەمی ژیان هۆنیویەتەوە، نەخاسمە زانایەکی کۆشا بووە (چ لە بواری تیووری و چ لە بواری پراکتیکی مەیدانیدا) لەوەشە خۆی بە ئەنقەست شیعری خۆیی پەردەپۆش کردبێ و نەیویستبێ وەکو شاعیرێك خۆی دەربخا، تا خۆی لەشەڕی وشکە زانا توندڕەوە فیشاڵبازە ئایینییەکان بپارێزێ، بگرە ناچاریش نەبێ بخزێتە نێو زەلکاوی ستایشکردن و هەڵەوەڕییەوە وەکو زۆربەی شاعیرانی باوەشی دەرباران و سوڵتانان و میران ، جگە لە زۆربەی شاعیرانی سۆفی و شۆڕشگێڕێن میناك شاعیرو داعیەی گەورەی ئیسماعیلی ناصر خوسرەو کە زاری خۆی بەپەسن وستایش نەلەوتاندووەو گوتویەتی : **" کە ویستت لەنگییەکانی گەردوون رێکبخەیەت ، دەبێ سیستەمی دنیایی هەڵبگێڕیتەوە "**

جا وێڕای ئەو گۆشەگیرییە شیعرییە ئەنقەستەی خەییام ، دەبینین لە چوارینەکانیدا، کە ژمارەیان ناگاتە دووسەد چوارینە ، وەکو یەکێك لە مەزنترین شۆڕشگێڕان دژی غەوارەیی و هاڤیبوونی بوونگەرایی و رامیاریی و جڤاکیی ئینسان وەستاوەو بگرە هەمیشە دژی چەوسانەوەی گەردوونی بووە ، بۆیەش جاویدیی و نەمریی بۆخۆی بەدەست هێناوە .

*

ئاشكرایه كه تەنیا چوارینەكانی خەییام پاچڤەوانانی دنیایان رانەكێشاوە ، بەڵكو بەرهەمە زانستی و فەلسەفییەكانیشی مایەی سەرنج بوونە ، بۆ یەكەم جار تۆماس هاید (١٦٣٠- ١٧٠٣) مامۆستای هەردوك زمانی عیبری و عەرەبی لە زانكۆی ئۆكسفۆردا، لە كتێبی (مێژووی ئایینە دێرینەكانی فارسی وپەهلەوی و میدی) دا بەزمانی لاتینی ، كه لە ساڵی (١٧٠٠) دا پەخشبۆتەوە ، باسی خەییامی زانای كردووەو بە یەكێك لە بەرجەستەترین ئەو زانایانەی ژماردووە كە زیگی ئێرانییان لە سەردەمی جەلالەددین مەلیكشای سەلجووقیدا چاكسازی و هەموار كردووەو، روانگەی فەلەكی ئەصفەهانی دامەزراندووە.

یەكەمین ئەوروپاییەكان كە نموونەیان لە چوارینەكانی خەییام وەرگێڕاوە ئەمانەن : تۆماس هاید لە ساڵی ١٧٠٠ دا یەك چوارینەی بۆ زمانی لاتینی وەرگێڕاوە ، فۆن هامەر بۆرگشتال (١٧٧٤- ١٨٥٦) لە ساڵی ١٨١٨ دا (٢٥ چوارینە) ی بۆ سەر زمانی ئەڵمانی وەرگێڕاوە ، سێر گور ئوزلی (٢ چوارینە) ی لە ساڵی ١٨٤٤ دا بۆ ئینگلیزی وەرگێڕاوە ، رۆژهەڵاتناسی فەرەنسی گارسن دوتاسیٚ (١٠ چوارینە) ی بۆ سەر زمانی فەرەنسی وەرگێڕاوە... ئیدی دوای ئەو پرزە پرزانەیە رێژنە بارانی وەرگێڕان دایكرد ، نەمازە پاش بڵاوبوونەوەی وەرگێڕانی فیتزجیراڵد (٧٥ چوارینە) بۆ ئینگلیزی لە ساڵی ١٨٥٩ دا.

بۆ زانینیش كۆنترین چاپی چوارینەكانی خەییام لەئێراندا بۆ ساڵی (١٢٧٤ ك= ١٨٥٧ ز) دەگەڕێتەوەو، (٤٥٣ چوارینە) ی لەخۆگرتووە ، بەڵام گەورەترین ژمارەی ئەو چوارینانەی كە بەناوی خەییامەوە لەچاپی لكنهودایە لە هندستاندا (٧٧٢ چوارینە) یە ، دوای ئەوە چاپی وینفلیدە كە (٥٠٠ چوارینە) یە لەگەڵ پاچڤە ئینگلیزییەكەیدایە ،

پاشان چاپی نیکۆلاس (١٨١٤- ١٨٧٥) که (٤٦٤ چوارینه) یه لەگەڵ پاچڤەی پەخشانیدا بۆ زمانی فەرەنسی...ئیدی سەدان چاپی چوارینەکانی خەییام بەزمانی فارسی و زمانانی دی بەدوادا هات...

هەر هەموو ئەوەی باسمان کرد لەجێی خۆیەتی و فرەڕەوی تێدا نیە ، چونکە خەییام کاریگەرییەکی گەورەی لەسەر کەلتووری جیهانیی هەس ، لە بزاڤی نوێخوازیی شیعری لەئەوروپادا. سەیریش ئەوەیە کە پاش ئەوەی ئەوروپاییەکان بلیمەتیی شیعریی و فەلسەفیی خەییامیان کەشفکرد، ئەو کەشفە رۆژهەلاتیشی گرتەوە!

بۆ نموونە کاریگەریی خەییام بەسەر ئەمانەوە دیارە : شاعیرو شانۆکارو هزرڤانی بەلچیکی مۆریس مەتەرلینگ (١٨٦٢- ١٩٤٩)، شاعیری ئەمریکی رۆبرت فرۆست (١٨٧٤- ١٩٦٣)، شاعیری کورد کەمالی (١٨٨٦- ١٩٧٤)، شاعیری ئەنگلۆئەمریکی ت.س.ئیلیەت (١٨٨٨- ١٩٦٥)، شاعیری پۆرتوگالی فێرناندۆ پیسووا(١٨٨٨- ١٩٣٥)، شاعیری ئیسپانی فدریکۆ گارسیا لۆرکا(١٨٩٨- ١٩٣٦) و ژمارەیەکی زۆر لە شاعیرانی عیراقی و عەربی میناك : جەمیل صدقی زەهاوی (١٨٦٣- ١٩٣٦)، ئیلییا ئەبوو ماڕی (١٨٨٩- ١٩٥٧)، مستەفا تەل (عەرار)(١٨٩٩- ١٩٤٩)، محەممەد مەهدی جەواهری (١٨٩٩- ١٩٩٧)، ئەلیاس ئەبوو شەبەکە (١٩٠٣- ١٩٤٧)، شاعیری هیندی هاریڤانش باچان (١٩٠٧- ٢٠٠٣)، شاعیری کورد عەونی (١٩١٤- ١٩٩٢)، مەهدی شەمماسی (١٩٢٠- ١٩٧٩)، عبدولوەهاب بەیاتی (١٩٢٦- ١٩٩٩) و حوسێن مەردان (١٩٢٧- ١٩٧٢)...

ئەمەو جگە لە شاعیرانی دێرین و نوێی ئێرانی و ئەفغانی و تاجیکی...لەوانەش : سەنائی غەزنەوی (م : ؟ ١١٤٥)، خاقانی شێروانی (١١٢٠- ١١٩٨)، شێخ مەجدەددین بەغدادی (م : ؟ ١٢١١ یا١٢١٧)، عەتتاری نیشابووری (؟ ١١٤٢- ١٢٢٩)، سیراجەددین

قومری (م : ؟ ١٢٢٧یا١٢٤٢ ز)، ئەسیرەددین ئەومانی (م : ١٢٥٨)، نەجیب جرفازقانی (م : ١٢٦٦ ز) بابا ئەفزەڵ کاشانی (؟ ١١٨٦-؟ ١٢٦٧)، ئیمام هورەوی (م : ١٢٦٨)، مەولانا جەلالەددین روومی (١٢٠٧- ١٢٧٣)، مەجدەددین هەمگر (م: ١٢٧٩)، نیزامەددین ئەصفەهانی (م: پێش ١٢٨١)، فەخرەددین عیراقی (م : ١٢٨١ ز)، سەعدی شیرازی (؟ ١٢١٣- ١٢٩٢)، پووربەهای جامی (م : ؟ لە نێوان ١٢٧٠ و١٣٣١)، خاجووی کرمانی (م : ١٣٥٢ ز)، عوبێدی زاکانی (١٣٠٠- ١٣٧١)، جەمالەددین سەلمان ساوجی (١٣٠٠-١٣٧٦)، حافزی شیرازی (؟ ١٣١٧- ؟ ١٣٩٧)، ئیبن یەمین (١٣٦٧-؟ ١٤٥٠)، عەبدولرەحمان جامی (١٤١٤- ١٤٩٢ز)، ئاصفی (١٤٧٨- ١٥١٧ز)، هیلالی جوغتائی (م : ؟ ١٥٢٩)، ئەهلی شیرازی (١٤٥٤- ١٥٣٦)، ئەمیر عەلی شیر نەوائی (١٤٤٠- ١٥٠٠)، سەحابی ئەسترابادی (م : ؟ ١٦٠١)، شێخ بەهائەددین عاملی (م : ١٦٢٢)، صائب تەبریزی (؟ ١٦٠٧-؟ ١٦٧٥)، محەممەد حوسێن عەنقا (م : ١٨٩٠) و میرزا محەممەد سەها(م : ١٩١٩).

هەڵبەتە شاعیرە هاومێژەکانیش لە کاریگەری چوارینەکانی خەییام بەدەرنین ، میناك : حوسێن قودس نەخەعی (١٨٩٤- ١٩٧٧) ناسراو بە (خەییامی سەدەی بیستەم ، کە بە راستی شایستەی ئەو نازناوەیە)، فەرڕوخی یەزدی (١٨٨٩- ١٩٣٨ ز)، نیما یوشیج (١٨٩٧- ١٩٥٩)، مەهدی سوهەیلی (١٩٢٤- ١٩٨٧)، فرەیدوون موشیری (١٩٢٥- ٢٠٠٠)، مەهدی ئەخەوان سالس (١٩٢٨- ١٩٩٠)، لایق شیرعەلی (١٩٤١- ٢٠٠٠) ، عەلی جەعفەری (ل : ١٩٤٤) و ئیرەج زەبەردەست (ل: ١٩٧٤)...

❋

لێرەشدا ئەوەی سەرنج راکێشە کاریگەریی جەماوەریی شیعری خەییامە کە لە رۆژئاوادا زیاتر دیارە تا لە رۆژهەلات ، بەو سیفەتەی "رۆحی رۆژهەلات و ماددییەتی رۆژئاوای" لەخۆگرتووە . هەلبەتە رۆژئاوایەکان وێنەی خەییامی شۆرشگێری دژی راسپاردە ئایینییەکان ، تەنانەت زەندیقیشیان لە لەلا خۆشەویستترە تا وێنەی خەییامی ئامۆژگار و ئیماندارو فەیلەسووفی ئیسلامی کە رۆژهەلاتییەکان حەزی لێدەکەن . یەکێك لەو کەلە رۆشنبیرانەی ئەوروپا کە ستایشی فەلسەفەی خەییامی هزرڤانی ئازادی کردووە ، هزرڤانی فەرەنسی **ئەرنیست رینانە** (١٨٢٣-١٨٩٢)، بەوەش چوونگە هەلەکەی خۆی سەبارەت بە فەلسەفەی ئیسلامی هەلوەشاندۆتەوە کە وتوویەتی : **"فەلسەفەی ئیسلامی هەمان فەلسەفەی یۆنانییە بەرێنووسی عەرەبی نووسراوە!"**

زۆر ئەدیب و هونەرمەندو هزرڤان و زانای رۆژئاوایی هەن کە دلبەندی خەییامن چ وەك شاعیرو چ وەك زاناو فەیلەسووف ، لەوانە : هونەرناسی فەرەنسی تیۆڤێل گوتیێ (١٨١١- ١٨٧٢) کە پێی وایە خەییام لە هزرڤانانی ئەوروپا گەورەترە بەپێی بەراوردکردن. هەروەها **ئاندرێ ژید** (١٨٦٩- ١٩٥١) بەتاسەوە وتوویەتی : **" ئێمە هەرگیز چاومان ناکەوێتە باخەکانی نیشابوور"** ئەمەش عیزرا پاوند (١٨٨٥- ١٩٧٢) شاعیرو پاچڤەوانی گەورەیە ، کە رەوانیی شیعری خەییام بەو ئاوە شوبهاندووە کە دەکرێتە نێو گولدان ، بگرە ناوی یەکێك لە کۆرەکانی ناوە (عومەر) کە بەخۆم لە ناڤینی هەشتایەکانی سەدەی رابردووا لەبەغدا دیتم و، بە هەردوك زمانێن فارسی و ئینگلیزی پێکڤە دووایین و، کۆ شیعرێکی چکۆلەی (لەدانان و پاچڤەی خۆی) نیشاندام.

ئینجا بە گەواهی **مــارتن ئێســپادا(ل : ١٩٥٧)** شــاعیری ئەمــەریکی (پۆرتــۆڕیکی ڕەسەن) کۆتایی ئەم بەشە دێنم ، کە دەڵێ : **" یەکەم کتێب کە کڕیم و سرووشبەخش و کاریگەربوو بەلامەوە پاچڤەی (چوارینەکانی خەییام) بوو لەلایەن فیتزجیراڵد، کە زۆر شەیدایبووم نەك لەبەر فەلسەفەکەی و بەس ، بگرە لەبەر مۆسیقای زمانەکەشی"**

*

هەڵبەتە لێکۆڵینــەوەو سەرچــاوەی فــرە دەربــارەی خــەییام و ئــەدەب و زانســت و فەلسەفەی خەییام، بەدەیان زمان هەیە و هێنــدە زۆرە ، کــە بــە پێــی قســەی **پییێــر پاسکاڵی** خەییاملۆجی فەرەنسی : **" ڕەنگە نیمچە مەحاڵ بێت کە بیبلۆگرافیایەکی تەواو ئامادەبکرێت بۆ هەموو ئــەو وەرگێــڕان و نووســینانەی کــە بــە خەییامــەوە پەیوەستن لەم سەدەیەی دوواییدا"** هەر بۆ نموونە تا ساڵی ١٩٦٠ پتر لــە (ســێ هــەزار کتێب و لێکۆڵینەوە و باســۆکە و گوتــار) دەربــارەی خــەیام و چــوارینە و بەرهەمــە زانستی و هزرییەکانی بڵاوکراوەتەوە...بێگومان ئەم ژمارەیــە لــەماوەی ئــەو پــەنجا ساڵەی دواییەدا گەییوەتە سێ چەنانە، بگرە پتریــش . هــەروەها پاچــڤەی ئینگلیــزی چوارینەکانی خەییام لە ئەمریکادا تا ساڵی ١٩٥٦ (**٣٠٠ جار**) لەچاپدراوە...

لەمەوە دەتوانین وێنای ئەوە بکەین کە شیعرو زانستی خەییام تا چ ڕادەیەك بووەتــە مایەی ڕاکیشانی سەرنج و بایەخدانی گەلان و نەتەوەکانی جیهان بۆ ئیران و هــەردوو کەلتووری کۆن و نوێشی .

جێی خۆیەتی لێرەدا ئاماژە بۆ چــەند ڕۆمــان و کتێبێــك دەربــارەی سەرگوزەشــتەی خەییام بکەین ، لەوانە :

× عومەر خەییام ، دانانی : ن . هـ . دۆل ، ١٨٩٨ پۆستن .

× چیرۆکی (گەڕانەوەی هایمەن) نووسین : ئۆ هنری (١٨٦٢- ١٩١٠) کە بەتوندی هێرش دەکاتە سەر خەییام ! چونکە لەو سەردەمە خەییامدۆستی لەلای خەڵکی ببووە (مۆدەیەکی هستیریائامێز) و ئۆ هنری بەوە زۆر پەست و قەڵس ببوو.

× رۆمانی (گورگی دەریایی) ی جاك لەندەن (١٨٧٦- ١٩١٦) کە خەییام تێیدا دەبیتە تەوەری باس و گفتوگۆی دووان لە کەرەکتەرەکانی رۆمانەکە .

× رۆژێك لەگەڵ عومەر خەییامدا، دانانی : ئا. بیرۆن ، ١٩١٤

× یوجین ئۆنێل (١٨٨٨- ١٩٥٣) لە شانۆنامەی (ئاه چۆڵگە !) دا زۆر باندۆرباری خەییامە بەو رادەیە ، کە ناوەڕۆکی چوارینەکانی خەییام ئامێتەی وتووێژی کەرەکتەرەکانە .

× رۆمانی (ژیانی عومەری خەییام) دانانی : دیرۆکڤان و رۆمان نووسی ئەمریکی هارۆڵد لامب (١٨٩٢- ١٩٦٢) لە ساڵی (١٩٣٦) دا

× (سەرگوزەشتەی خەییام) دانانی : ئا. ج . بۆتەر.

× (قەڵای دالاش) نووسینی مانوێل کۆمۆرن ( **کە عومەر ئەبوو نەصر بەدەستکارییەوەو بەو سەرناڤە وەرگێڕاوەتە عەرەبی)**

× ژیان و ئەڤین و حیکمەتی خەییام ، دانانی : م . کۆمرۆف ، ١٩٥٧ نیویۆرك.

× شانۆنامەی (دادگاییەك لەنیشابوور) دانانی : عەبدولوەهاب بەیاتی

× رۆمانی (سەمەرقەند) دانانی : ئەمین مەعلووف ، لە ١٩٨٨، کە لە٢٠١١ دا لە کوێت کراوەتە نمایشنامەو پیشاندراوە.

× رۆمانی خەییام ، دانانی : تیگەر سوهنێ گیسێ ، ٢٠٠١

× رۆمانی خەییام ، دانانی : س . تۆمبسون ، ٢٠٠١

× رۆمانی تۆمارئامیزی (ژیانی خەییام) ی نووسەری ئێرانی مستەفا هزاوەی ، ١٩٨٩

× ڕۆمانی(خەییام و ئەو درۆ شادیبەخشە) ی نووسەری ئێرانی هۆشەنگ موعین زادە ، کە ڕۆحی خەییام ڕۆڵێکی سەرەکی تیا دەبینێت .

**ئینجا دەبێ بگوترێ کە لەماوەی دەیەی یەکەمی سەدەی بیست و یەکدا چەندین کتێبی گرنگ دەربارەی خەیام بڵاوبوونەتەوە ، لەوانە :**

× (عومەری خەییام شاعیرو زانای بیرکاری) بەزمانی ئیسپانی ، نووسینی باسکار ریکاردۆ مورینو کاستیلۆ ، لەساڵی ۲۰۰۲ دا

× کتێبێکی هەژیر تەیموریان ، بێژەری بەنێوبانگی رادیۆ (**ل: ۱۹٤۰- کوردستانی ئێران و لەلاوێتییەوە ئاکنجی بەریتانیایە**)

× می و مینا سیری در زندگی و آثار حکیم عمر خیام نیشابوری/ بکوشش: علی دهباشی/ چاپ اوّل (۲۰۰٤) هنر سرای گویا- تهران

× (بیرکاریی عومەر خەییام) د. روشدی راشد و د. بیجان وەهاب زادە/ پاچڤەی: د. نێقۆلا فارس بۆ عەرەبی لە فەرەنسییەوە، ۲۰۰٥ بەیرووت

× خیام نامه ، روزگار، فلسفه و شعر خیام/ محمد رضا قنبری/۲۰۰٥ تهران

× رباعیّات حکیم خیّام (طربخانهء یار احمد رشیدی....) با مقدمه وحواشی: عبدالباقی گولپینارلی/ باهتمام: رحیم رضازادهء ملك (۲۰۰۷) تهران

× عومەر خەییام زانای فەلەکی و بیرکاری و نەورۆزنامەکەی/ و: رەمەزان رەمەزان متوەللی/ ۲۰۰۸ قاهیرە.

× دیوانی عومەر خەییام (بە عەرەبی)/ لێکۆڵینەوەو ساغکردنەوە و پاچڤەی جەلال زەنگابادی/۲۰۱۰ بەیرووت

× هستی و مستی/ حکیم عمر خیّام نیشابوری/ بەروایت: حکیم دکتر دینانی/ گفتوگو از: کریم فیضی/ چاپ دوم (۲۰۱۰) تهران

× خەیام نامە ، روزگار ، فلسفه و شعر خیام/ محمد رضا قنبری/ چاپ چهارم ٢٠١٠ انتشارات زوّار- تهران

× (عومەر خەییام) لێکۆڵینەوە ، دانانی : هەنادی زەرقا، ٢٠١١

× عومەر خەییام لە لێتوێژینەوەکانی باسکارانی عەرەبدا، دانانی: بەهروز قوربان زادە ، ٢٠١١ بەیرووت ، بە عەرەبی .

× چنین گفت خیام/ علی جعفری/ ٢٠١١ نشر نشانه — تهران

× حیکایەتێك دەربارەی خەیام/ نووسەری ئەبخازی گیۆرگی گولێا/ پاچڤەی: زیاد مەلا/ ٢٠١٢ دیمەشق

× رباعی های خیّام و نظریه کیمیّت زمان/ د. علی تسلیمی/ ٢٠١٢ کتاب آمه — تهران

× عمر الخيّام ، أعمال عربيّة وأخبار تراثيّة/ جمع وتصحيح ودراسة : الدكتور يوسف بكّار/ ط ١/ ٢٠١٢ دار صادر- بيروت

× کتێبی(میسواك) ی وەرگێڕو نووسەری فەرەنسی جان ئیف لاکروا، کە سەرگوزەشتەی عومەری خەییام دەگێڕێتەوە، سەرباری کەمی ئەو زانیاریانەی کەدادی هیچ نووسەرێك نادات کتێببێکی گەورە بەشێوەیەکی بابەتی و تەوای پێ لەسەر خەییام بنووسێت، سەرەڕای ئەو گێنگەشەو مشتومڕە گەرمەی لە کۆنەوە تا نهۆ دەربارەی ژیان وشیعرو فەلسەفەی خەییام هەبووەو، وێڕای زۆری ئەو چوارینە نێوەرۆك هەڤدژانەی دراونەتە پاڵ خەییام. سەرباری هەموو ئەوانەش لاکروا لە کتێبەکەیدا بەشێوازێکی زیاتر حیکایەتوانی تا زانستی، شتێکی زۆر نزیك لەواقیع و مەنتیقەوە دەربارەی ژیانی خەییام پێشکەش کردووە.

❋

هەروەها گەلێك لە هونەرمەندانی شێوەکاریی (ئێرانـی و بیـانی) وێنـە و شـیعری خـەییامیان ئاوێتـەکردووەو، گـەلێك دیمـەنی نـاو چـوارینەکانیان بەنێگارکێشـی بەرجەستەکردووەو، زۆربەی چـاپەکانی چـوارینەکانی خـەییامیان پـێ رازاندۆتـەوەو، دیارترین فلیڤانانی ئەم مەیدانە بریتین لە : کەمالـەددین بـەهزاد (؟ ١٤٦٠-؟ ١٥٣٥)، ئەلیهۆ فیـدەر(؟!)، ئیدمۆنـد دولاك (؟!)، گیلبـەرت جـەیمس (؟!)، بولـدریچ (؟!)، سەرکیس خاچادۆریان (هونەرمەند و ئارکیۆلۆجیستێکی ئەرمەنییـە)(؟!)، ئەکبـەری تەجویدی (؟!)، قوربان ئەجەلی ئازەربایجانی (؟!)، محەمەدی تەجویدی (١٩٢٤-١٩٩٤)، جەببار بەگ (؟!)، حوسێن بەهزاد (١٨٩٤- ١٩٦٨)، مەحموود فەرشچـیان (**ل** : ١٩٣٠)، غولام رەزا ئیسماعیل زادە(؟!)، رەسسام ئەرژەنگی (؟!) و شاهروخ گولستان (؟!) کە بەوێنە فۆتۆگرافیە مۆدێرنەکانی هەردوك دوا پاچڤە ئینگلیزییەکەی کـەریم ئیمـامی (١٩٣٠- ٢٠٠٥) و پاچڤە فوئاد رۆحانی (؟!) رازاندۆتـەوە لـەبری مینیـاتۆرە ئاسـاییە باوەکاندا.

هەژی ئاماژەشە کە باندۆری چوارینەکانی خەییام لە زۆر بەرهـەمێن هونەرمەنـدانی ئێرانی هاومێژ روونە ، وەك چەندین بەرهەمی پەیکەسازی ناڤدار پەرویز تەناڤلی (ل : ١٩٣٧) ، نەمازە پەیکەری (هیچ)

لێرەشدا پێویستە ئاماژەبکرێت بۆ ئەو پەیکەرسازانە ، کە پەیکەریان بۆ خەییام کردووە، میناك : ئەبولحەسەن صددیقی (١٨٩٧- ١٩٩٥) و حوسێن فەخیمی (**ل** : ١٩٤٥).

**موحسن فەرزانە**(؟!) پەیجۆری ناڤدار ئاماژە بۆ فەزلی چوارینەکانی خەییام دەکا لە ژیاندنەوەو زیندووکردنەوەی هونەری رەسم و نیگار، نەمازە هونەری مینیاتۆر، کە لە

سەدەکانی **(١٦، ١٧ و١٨)**دا گەشەی کردبوو، پاشان لە ئـاخروئۆخری سـەدەی هـەژدەدا دایـەکزی و خـەریکبوو ئـاوا ببێـت ، بـەڵام وەل ڤـەژینی چـوارینەکانی خەییامـدا سەرلەنوێ بوژایەوە ، بەتایبەتی لەگەڵ چاپەکانی دوایینی سەدەی نۆزدەیەمدا.

دیارە ئەم حاڵەتە هونەری خۆشنووسیشی گرتۆتەوە ، نەك هەر لە ئێراندا ، بگرە لـە هیندستان و وڵاتانی دیکەشدا...جا هەر لێرەشدا جێی خۆیەتی ئاماژە بکرێ بۆ ئـەو پیشانگا سیرامیکییە دووقولّییەی هونەرمەنـدێن هۆڵانـدی ماریـا ئانادیۆنـد و یـۆلا بوشهێر، کە لە تەمووزی ساڵی ٢٠٠٨ دا کرایەوە ، پارچـە هونەرییـەکانی بەتایبـەتی (گۆزەکان) بەچوارینەکانی خەییام ( پاچڤەی فیتزجیراڵد) رازاوبوونـەوەو، پێشـوازی و ستایشێکی گەورەی لێکرا.

هەڵبەتە دەبێ ناوی هەندێ لەو خۆشنووسە فلیڤانانە بێنین ، کە چوارینەکانی خەییامیان چ لە کۆن و چ لە ئێستادا نووسیوەتەوە ، یان وێنەی تابلۆیانێکیان کێشاوەو، هەردوك هونەری نیگارکێشی و شیعریان ئاوێتەی یەکدی کردووە ، لەوانە : سوڵتان عەلی مەشهەدی (١٤٣٧- ١٥٢٠)، مـــیر عیماد قەزوێنی (١٥٥٣- ١٦١٥)، حوسێن خوسرەوی (؟!) ، فاتیح عیززەت پوور (؟!) ، عەبباسی مەنزووری (**ل** : ١٩٢١)، غولام حوسێن ئەمیرخانی (**ل** : ١٩٣٩)، هاشم زەمانیان (**ل** : ١٩٥٥)، خوسرەو رۆشن مازەندەرانی (؟!)، نەصروڵڵا ئەفچەی (؟!) و رەسوولی مورادی (؟!)...

❋

دەبـێ ئـەو مۆزیکسـازانەش فەرامۆشـنەکەین کـە سرووشـی بەرهەمـەکانیان لـە چوارینەکانی خەییامەوە وەرگرتووە ، هەروەها گەلێك لەو مەقامبێژو سترانبێژە پیاوو

ئافرەتانــەی کــە بەفارســی و بــەزمانانی تــر ، نەخاســە بــە زمــانێن رۆژهــەڵاتی ، چوارینەکانیان بە دەنگ و ئاوازی خۆش چڕیوە ، هونەرمەنــدان نــازم غــەزالی و ئــوم کەلسوم دوو نموونەی گەشی ئەم مەیدانەن لە وڵاتی عەرەبدا. هەروەها ئەو بێژەرانەی کە چوارینەکانی خەییامیان بەشێوەیەکی هونەری لە رادیۆو تەلــەڤزیۆن و کاســێت و سیدییاندا خوێندۆتەوەو تۆمارکردووە...

ئەوەی لەم بیافەدا سەرنجی راکێشام (خیّام خوانی = خەییام سترانڤانی) یە ، کە لــە باشووری ئێران (دەڤەری بووشەهر) دا گەلێك لە چوارینەکانی خەییام وەل مۆســیقای شادبەخشدا لە بۆنە خۆشــئامێزەکانا دەســترێن و، هونەرمەنــدانی بەرجەســتەی ئــەم مەیدانە : **بەخشۆ (جیهان بەخش کوردی زادە)** و **ســەلمان ســەلمانی و غــولامڕەزای وەززانی** — ین . ئەم (خیّام خوانی) یــە هاو(شــروەخوانی و فــایز خــوانی) یــە ، کــە دووبەیتەکانی هۆزانڤانان فــایز دەشــتی (١٨٣٤- ١٩١١) و بابــا تــاهیری هەمــەدانی و مەفتوون بوردەخوونی و بــاکی- ش وەل مۆســیقاو ئــاوازی غــەمگین دەســترێن ، لــە دەڤەرەیلی : دەشتستان ، تەنگستان ، بووشەهر و خووزستاندا.

لێرەشدا ئاماژە بۆ (رۆژەیلی چوارینەکانی خەییام) دەکەین ، کە کارێکی شانۆیی — مۆزیکییە ، لــە دەرهێنــانی : د. جــەببار حەســەن ، کــە لــە ٢٠٠٤ دا لــە بــەیرووت پیشاندراوە ، کە شایستەی ئاماژەیە . هەروەها فێستیڤاڵی (جەلۆەکانی گەردوون) کە لە ٢٠١٢ دا لە شاری فاسی مەراکشدا، بە یادی خــەییام وەك هێمایــەکی ســۆفییانەی گەورە بەڕێوەچوو.

❋

هەروەها خەییام غەزوی جیهانی سینەمای کردووە ، لێرەدا جێی خۆیەتی ئاماژە بۆ ئەو فیلمە بکرێ کە ئەلبێرت لویس لە ساڵی ١٩٤١ دا لە هۆلیوود بەناوی (عومەری خەییام) دەریهێناوە ، گەرچی نەیتوانیبوو وێنەیەکی راستەقینەی روونی کەسایەتی مەزنی خەییام پیشانبدا . هەروەها فیلمی (کەلەپووری ئەفسانەیی عومەری خەییام) کە هونەرمەندانی هەشت وڵات تێدا بەشداربوون و، هونەرمەندی ئیسپانی برۆنۆ لاسترا رۆڵی فەیلەسووف و زانای نیشابووری تێدا بینی و، لە شارانی سەمەرقەندو بوخارا وێنەی گیراوەو بە گوێرەی قسەی مێشکا ستیڤانۆزیچی بەڕێوەبەری بەرهەمهێنانی فیلمەکە (کە لە ماوەی سی ساڵی ژیانی هونەری خۆیدا پتر لە سەد فیلمی بەڕێوەبردووە) ئامادەبوونی چەند کۆمپانیایەکی هۆلیوودی و دەیان هونەرمەندی هەشت وڵات : (ئەمریکا، ئەڵمانیا، ئێران، ئیتاڵیا، صربیا و هیند...و صەت و بیست ئوزبەکی - ش) کە ئەمە خۆی لەخۆیدا بیرخستنەوەیەکە بۆ هەموو جیهان ، کە خەییام وێژەڤان و هزرڤان و زانای ناوازەو دەگمەن بووەو، میناکی مرۆڤێکی ئازادو جوامێر لەسەدەکانی ناڤیندا لەرۆژهەڵاتدا ژیاوە، کە هاوتای لەیۆنارد داڤینشی بووە لە ئەوروپا !

هەروەها فیلمێکی تۆمارئامێزیش هەیە بەناونیشانی (عومەری خەییام بلیمەتی پرسیارڤان) کە تۆڕی تەلەڤزیۆنی فارسی (بی بی سی) لە (٢٠٠٩/١٢/١٣) دا بڵاویکردەوە، ئەم فیلمە دەربارەی پلەو پایەی رۆشنبیریی خەییامە ، کە مینا زانایەك و فەیلەسووفێك جەختی لەسەر کراوە تا وەکو شاعیرێك و، ژمارەیەکی بژاردە لە باسکارانی ئێرانیی و بەریتانیی و ئەمریکایی و کەسایەتیانی رۆشنبیریی و هونەریی چالاك ، کە دوا ئەنجامگیریی لێکۆڵینەوەو باسەکانی خۆیان سەبارەت بە خەییام و

بەرهەمە زانستیی و فەلسەفیی وئەدەبییەکانی تێدا پێشکەش کردوونە ، لەوانە : **محەممەد** ئیسلامی نودوشەن (**ل** : ١٩٢٥) پەیجۆری بەرزو دیاری ئێرانی کە باسی پایەی خەییامی لە کەلتووری ئێرانیدا کردووە ، داریووش شایگان (**ل** : ١٩٣٥) فەیلەسووفی بەناقودەنگ باسی بایەخی بۆچوونە فەلسەفییەکانی خەییامی کردووە ، ڕۆماننووسی گەورەی ئێرانی مەحموود دەوڵەت ئابادی (**ل** : ١٩٤٠) باندۆری خەییامی لە ئەدیبانی دوای خۆیەوە نیشانداوە ، هونەرمەندی سترانبێژی بەناوبانگ **محەممەد** ڕەزا شەجەریان (**ل** : ١٩٤٠) ڕای خۆی لەمەڕ خەییام و ئیلهام وەرگرتنی مۆزیکسازانی ئێرانی لەشیعرەکانی دەربڕی و، خوێندنەوەی چوارینەکانی خەییام لەلایەن شاعیری گەورە ئەحمەدی شاملوو (١٩٢٥- ٢٠٠٠) دگەڵ مۆسیقای هونەرمەند فەرەیدوون شەهبازیان (**ل** : ١٩٤٢)، لەساڵی ١٩٧٦ دا، بە گرنگترین کاری هونەری ئەم مەیدانە ژماردووە. پاشان هونەرمەند ئایدن ئاغداشلوو (**ل** : ١٩٤٠) کاریگەریی چوارینەکانی خەییامی لەسەر هونەری شێوەکاری ئێرانی تاوتوێ کردووە، نەمازە لەسەر مینیاتۆر.

هەژی باسە کە ئەم فیلمە لە پێشدا بەزمانی ئینگلیزی نمایشکراوە ، هەروەها لە چەند وارگەیەکی ئینتەرنێتیش بە هەردوك زمانی ئینگلیزی و فارسی پەخشبۆتەوە. بە گوتەی صادق صەبا(سەرۆکی بەشی فارسی لە بی بی سی) فیلمەکە هەفتەیەك بەر لەهەڵبژادنەکانی سەرۆکایەتی کۆماری ئێرانی لە بەهاری ٢٠٠٩ دا ئەنجام دراوە، کە هەنگێ هیچ دڕدۆنگییەك لەنێوان (بی بی سی) و دەسەڵاتی ئێرانیدا نەبووە، بۆیە ڕێ بە وێنەگرتن و جێبەجێکردنی فیلمەکەی دراوە.

هەر لێرەشدا دەبێ ئاماژە بکرێ بۆ دراماى تەلەفزیۆنى (عومەر خەییام) لە دانانى : غەسسان جوباعى و دەرهێنانى : شەوقى ماجرى ، کە (٢٣ گەوە ، هەر گەوێکى ٤٤ خولەکە) و لە تەلەفزیۆنى سووریا لە ٢٠٠٢ دا نمایشکراوە.

*

خۆش ئەوەیە دەبینین هەندێ کەس ئەم چوارینە یا ئەو چوارینە لەسەر جەستەى خۆ بە تاتوو(خاڵ) دەنەخشێنن، هەڵبەتە بەگوێرەى فەلسەفەى خۆیان لە ژیانـدا، بۆ نموونە ئافرەتێکى شۆخ و شەنگ ئەم چوارینەیەى بەزمانى فارسى لەسەر بازووى خۆى نەخشاندووە (وێنەکەییم لەسەر وارگەیەکى ئینتەرنیتیدا بینى):

**" از دی کی گذشت هیچ ازو یادمکن..."**

**واتە :**

" دوێنى کە گوزەشت قەت مەهێنەوەیاد..."

جا بەو جۆرە خەییام کانیاوێکى هەمیشە بەجۆش و هەڵقوولاوەو، باشترین بەڵگەش ئەو فێستیڤاڵە گەورەیە بوو(بە درێژایى سێ رۆژ) کە بەیارمەتیى رێکخراوى یۆنیسکۆو بەشداریى بەرزترین لایەنگەلى پەیوەندیدارو، گەورە خەییامناسانى هەر چوار نکالى جیهانەوە، لە نۆسەدەمین ساڵیادى مردنیا هاتەگێڕان : ئینگلتەرا، ئیسپانیا،ئەڵمانیا،ئەمریکا،فەرەنسا،ئوزبەکستان،تاجیکستان،تورکیاوهیندستان...

دیارترینیان : ژیلبەر لازار (ل : ١٩٢٠)، بۆریس روزینفیلد (١٩١٧- ٢٠٠٨)، ریچارد لۆرج...

لـــە کـــۆی (١٥٠) بەرهەمی بەشداران ، کە بەدەستی لیژنەی سەرپەرشتی فێســتیڤاڵەکە گەیشــتبوو (٣٣) گــوتــارو تــۆژیــنەوەیان پێــشــکەش و موناقەشـــەکران ...هەر هەموویانیش دەربارەی پایەی بەرزیی ئەدەبی و عیرفانی و زانستی خەییام و کاریگەریی بەرچاوی بەســـــەر ئەدەبیـــــات و زانســـــــت و هونەرەوە بوو...ئەمەو جگــە لــە روونــکردنەوەی دیمــەنی ئەبســتمۆلۆجیی و رامیــاریی و جڤاکیی شــــــاری نیشابووری ئەو رۆژگارە.

شایەنی باسیشە دیارترین کتێب کە هاوکاتی ئەو بۆنەیە چاپ وبڵاوکرایەوە چوارینەکانی خەییام بوو، بەخەتی برێلی تایبەت بە نابینایان ، لە (٨٠ لاپەرە) دا، لە ئامادەکردنی دکتـــــۆر جەلالەددینی کەزازی (ل : ١٩٤٨)، بۆ زانینیش پێشتر چوارینەکانی سەعدی و حافزی شیرازی بەهەمان خەت بڵاوکراونەتەوە.

رەنگــە ســەیرترین کتێــب کــە تــا (ســاڵی ٢٠٠٥) پەخشــبووبێت ، ئــەو کتێبــە ئەلەمنیۆمییە بێت کە بەخەتی هونەرمەندی خۆشنووس غولام حوسێن ئــەمیرخانی نووسراوە و، (١١٠ چوارینە) ی لە پێنج فەسڵدا لەخۆگرتۆتەوە، کە بریتییــە لــە (١١٢ لاپەرە) درێژیی هەر لاپەڕەیەك (مەتر) ێکە و پانییەکەی (٦٦ سەنتیمەترە) و، هەموو لاپەڕەکانی بە مس دەمارسازی کراوەو کێشی هەر لاپەڕەیــەکی (چــوار کیلۆگرامــە) کەواتە کێشی کتێبەکە نزیکەی (٤٠٠ کیلۆگرامە) ! کتێبەکە بــەجۆرێك دروســتکراوە کە شێ و ژەنگ زیانی پێنەگەیێنێت و، هونەرمەندی پیشــەڤان نیعمــەتولا نیکــویی دروستی کردووە ، کە پتر لە چواردە هەیڤ پێوەی سەرقاڵ بــووە، بڕیاریشــە پاچــڤەی ئینگلیزی و فەرەنسی چوارینەکانیش بخرێنە پشتی لاپەڕەکانەوە.

هەر بەم بۆنەیەوە ئاماژە بۆ ئەو ئاهەنگ و بۆنە سالآنەیە دەکەین کە لـە رۆژی ۲۸ ی ئوردی بەهەشتدا ( مانگی دووەمی سـالپێوی کۆچـیی هـەتاویی ئێرانییـەو، لـە دوا سێیەکی نیساندا دەست پێدەکاو لە سەرەتای دوا سێیەکی مایسدا تەواودەبێت) ئـەو بۆنەیە کە بۆ سالیادی خەییام دەگێڕدرێت ، لە بەرواری ۱۸ مایسدا، لـە ئێـران و لـە دەیان ولاتانی دیکەی دنیادا..لە سالی ۲۰۰٤ دا، لە پتر لە پەنجاو پێنج ولاتدا ئاهەنگ و فیستیڤال بۆ خەییام گێڕدرا.

*

شۆرەتی خەییام لە هەردوك ئاستی فەرمیی و میللیی لە ئێران و لە هەندەراندا یـەگجار باوو بلاوە...لە ئێراندا شارۆچکەیەکی پیشەسازی نزیکـی نیشـابوور بـەناوی خەییامـەوە ناونراوە. هەروەها ویستەگەیەکی شەمەندەفەریشی بەناوەوە نێـونراوە. لـە سـالی ۱۹۸۰ دا هەسـارۆکێك دۆزراوەتـەوەو بـەناوی خەییامـەوە نێـونراوە (**omarkayyam3095**)، هەروەها زۆر بازاڕو دوکانی بازرگانیی و کۆمپانیـای هەمـەجۆر و خواردنگـە وهوتێـل و بـارو نۆشـینگە و سـینەما و تیـاترۆ و شـەقام و باخچـەو قوتابخانـە و کەلوپـەل بـەناو خەییامەوە نێونراوە ، جگە لە بوتلە شەرابی سوور لـە فەرەنسـاو میسـردا...کە بـەناوی خەییامەوە نێونراون ، هەلبەتە عومەر خەییام لە چالاکیی و چەلەنگیی زۆربەیان بەرییە ! وێڕای هەموو ئەوانەی سەرەوە ، بە گوزارشـتی ئـەدیب و باسـکاری مـەزنی ئێرانـی **صادق هیدایەت :**

**" بەدەگمەن لەسەرانسەری دنیادا کتێبێك هەبێت وەك (چوارینەکانی خەییام) پەسەندو ستایش کرابێت ، رەفزکرابێت ، تووڕدرابێت ، شێوێندرابێت ، بوختانی پێداکرابێت ، سەرکۆنەو مەحکووم کرابێت ، لۆکەئاسا هەلاجی کرابێت و، شوهرەتی جیهانی وەرگردبێت ، کەچی بە نادیاری و ئاڵۆزی و غامزی مابێتەوە !"**

کەواتە ئەمەیە خەییامی نەمر، کە نزیکەی هەزار ساڵێکە لەبەینی بەرداشی پیرۆزاندن و کوفراندندایە ، ئەهلی شەریعەت دەیبوغزێنن و خەڵکی خۆشیانگەرەکە ، نەمازە دەستەبژێری ئەدیبان و هونەرمەندان و فەیلەسووفان و زانایان ، بەلاّم خۆشەویستیی لە نێو خەڵکیدا لەبەرئەوە نیە کە ئەهلی شەریعەت دەیبوغزێنن ، چونکە زۆربەی پیاوانی رۆحانیی ژێراوژێر خەییامیان لە زۆربەی شاعیرانی تر خۆشدەویّ ! هۆیەکەشی لەو هزرە پارادۆکسییە (هەڤدژانە) خەییامییە پەنهانەیە ، کە لە مێشك و زەینی رۆحانیانیی ئێرانیی و غەیرە ئێرانیدا دەخولێتەوە !

*

زەهیرەددینی بەیهەقی (١١٠٥- ١١٦٩) و مێژوونووسانی دیکەش خەییامیان لەبواری دانان و نووسین و وانەگوتنەوەدا بە رژد وەسف کردووە ، بەلاّم ئەم گازندەیە دروست نیە ، چونکە چۆنیێتی هەمە جۆریی مەیدانی نووسینەکانی فەرامۆش دەکەن ، کەچی عیبرەت لە ژمارەو قەبارەی دانراواندا نیە ، بەڵکو عیبرەت لە جیددییەت و تازەیی و ئیزافەکاریی داهێناندایە ، کە لەوەیە چڕە گوتارێکی سفت لەڕووی سوودو بایەخەوە هاوتای کتێبێك بێت یا زیاتریش . هەڵبەتە فەتحە نوێیەکانی نامە زانستییەکانی خەییام نموونەیەکی گەش و دیارن ، کە خەییام بە هۆیانەوە پێشەنگایەتیی گەورەی لە

بوارێن بیرکاری و فیزیاو گەردوونناسیدا بەدەست هێناو بە سەدان ساڵ پێش سەردەم و ڕۆژگاری خۆی کەوتووە ، میناك ئەوەی زانا لیباژیڤسکی (١٧٩٣- ١٨٥٦) لە ڕەنگرشتن و چەسپاندنی ئەندازەی نائیقلیدیدا بەدی هێناوەو، ئەنیشتاین (١٨٧٩- ١٩٥٥) لە (تیووری ڕێژەیی) بەناوبانگەکەیا بۆ خۆی قۆستییەوە.

خەییام زۆر پێشتر لە نامەکەیدا دەربارەی ئەندازەی ییقلیدس ، کە لە ساڵی (١٠٧٧ ز) دا داینابوو، گەییشتبووە هەمان دەرەنجام ! ئەمەو جگە لەو کەشفە زانستییە کە پاش چەندین سەدە بە (سێگۆشەی پاسکاڵ) (١٦٢٣- ١٦٦٢) و (جووتە رستەی نیووتن) (١٦٤٢- ١٧٢٧) ناسرا، خەییام لەوەشدا رابەربوو، وێڕای ئەو دەسپێشخەرییەی ، خەییام بەگومان بووە کە گۆی زەوی ڕاوەستابێت و تەوەرەی هەسارەکانی تر بێت و، بۆ قوتابییەکانی تاقیکردنەوەیەکی لەم بوارەدا کردبوو، کە مۆمێکی هێنابوو بە(هەتاوی) شوبهاندبوو، زەوی و هەسارەکانی دیکەشی بە شتێن دیکەی شوبهاندبوون ، کە بە دەورەیا دەسووڕانەوە . بەمەش هەر زوو بۆچوونێکی پێچەوانەی بۆچوونی هەموو زانایانی ڕۆژگاری خۆی خستبووە ڕوو!

ئەمەو جگە لە حەللی هاوکێشەی پلە سێ و هەمواركردنی ساڵپێوی ئێرانی .

جا بەبۆنەی ناوهێنانی ئەم ساڵپێوە جێی خۆیەتی نێوی ئەو زانایانە بێنین کە لە چاکسازیی و هەمواركدنی ساڵپێوی نێوبراودا هاوکاری خەییامیان کردووەو، خەییام بەوپەڕی شایستەیی لەنێویاندا بەدیار کەوتووە ، لەوانە :

(١) خەواجە عەبدوڕڕەحمان خازنی مەروەزی (م : ؟ ١١٥٥) شاگردی خەییام : زانای بیرکاری ، فیزیا، فەلەك و میکانیك بووە . ئەم بەرهەمانەی هەس : (الزیج السنجری)، (الزیج الخازنی) و کتێبی (میزان الحکمە).

**(خەواجە = خاجە بەمانای : مامۆستا، پیر، سەیدا دێت/ ج.ز)**

(٢) خەواجە ئەبو حاتەمی ئەبو موزەففەری ئیسفیزاری (م : ١١٢١ ز) خودانی ئەم بەرهەمانەیە (الآثار العلوية أو كائنات الفضاء)، (ميزان ارخميدس)، (مختصر اقليدس)، (منتخب كتاب الحيل) و (ميزان الحكمه)

(٣) حەکیم ئەبو عەبباس لۆکری (کورد) : شاگردی بەهمەنیاری فەیلەسووف بوو. چەند نامەیەکی هەس وەل کتێبە پڕ بەهاکەیدا (بيان الحق بضمان الصدق).

(٤) حەکیم مەیموون نەجیبی واسیتی : زانای بوارێن پزیشکی و بیرکاری و فەلەك.

(٥) محەممەد ئەحمەد مەعمووری بەیهەقی : زانای مەیدانی بیرکارییەو، نامەیەکی دەربارەی (مخروطات = قووچکەکان) هەیە .

(٦) ئەبو فەتحی کوشکی بەیهەقی : گەردوونناس .

دەڵێن خەییام هاوبەشیانە وەل ئەبو عەبباسی لۆکری و ئەبو فەتحی خازنیدا (الزيج السنجری) لەبواری ئەستیرەناسیدا داناوە.

وێڕای هەموو دانان و چالاکییەکانی خەییام ، خەڵکانێك هەن ، تەنانەت لە ئێرانیش پلەوپایەی زانستی خەییام نزمدەکەنەوە ! بۆ نموونە باسکار ئەحمەد بیرشك (١٩٠٦-٢٠٠٢) دەڵێ کە خەییام تەنیا بە ڕێکخستنەوەی ئەو ساڵپێوەی کە لە ئێرانی دێریندا بەکاردەهێنرا، بوو بە خاوەنی ساڵپێوی ئێرانیی ، واتە هیچی نەکردووە جگە لە سووکە هەموارکردنێ و ڕێکخستنەوەیەکی ئەو ساڵپێوە باوە !

بەهەر حاڵ... ڕەنگە دانراوەکانی خەییام لەوەی پێمان گەییشتوونە زۆرتر بووبن ، بەڵام چەپۆکی ڕۆژگار و دەوەرانی زەمان زۆری لێ ونکردبن و فەوتانبن ،

بەتایبەتی لەکاتی هێرشی مەغۆل و شەڕوشۆڕو لەسایەی دەسەڵاتە یەك لەدووی یەکە زاڵمەکاندا...

لێرەشدا پێویستە ئاماژە بۆ ئەوەبکرێ کە چۆن (فرووغی) باسکاری شارەزای گەورە ، ستایشی ڕێبازی خەییامی لە بواری نووسیندا کردووە ، کە بریتی بووە لە کەمیی بەرهەم و بایەخدان بەچۆنێتیی بەرهەم و، تەنیا لـەکاتی پێویستدا بەرهەمی نووسیوەو، خۆی لەدووبارەکردنەوە بـواردووە. ئەمـەش لیستی ئـەو بەرهەمانەیە کە بە هی خەییام لە قەڵەم دەدرێن و، زۆربەیان بەزمانی عەرەبین و نزیکەی نیمەیان بزرو فەوتاون :

(١) باسی چوار رەگەزەکە/ بەشێکە لە نامەی (راڤەی ئارێشەکان لە کتێبی مۆسیقادا)

(٢) نامەیەك (سـیپار) بـۆ راڤـەی ئارێشـەیێن سـەلمێنراوەکانی کتـێبی ئیقلیـدس : دەربارەی هێڵە تەریبییەکان و تیووری ڕێژەکانە .

(٣) نامەیەك بۆ دابەشاندنی چواریەکی بازنە .

(٤) نامەیـەك بـۆ بەڵگـەکان لەسـەر کێشـەکانی جـەبرو موقابەلـە : دەربـارەی هاوسەنگییەکانی پلەی سێیەمە .

(٥) نامەی تەرازووی حوکم : بۆ دۆزینەوەی چەردەی زێڕو زیو لە تەنێکی ئاوێتەکراودا لێیان .

(٦) پێویستی هەڤدژی لە جیهان و جەبر و مانەوە .

(٧) نامەی رووناکی ئاوەزیی لە بابەتی زانستی گشتگیریدا .

(٨) نامەیەك بۆ بەرسڤی سێ پرسیار .

(٩) نامەیەك دەربارەی هەستی (بوون) .

(١٠) نامەیەك سەبارەت بە گەردوون و پەرستن : دەربارەی حیکمەتی پـەروەردگارە لـە ئافراندنی کەون و حیکمەتی پەرستن .

(١١) نامەی پێداوێستییەکانی شوێنەیل : لە بواری زانستی کەش و ئاوو هەوا.

(١٢) نامەیەك دەربارەی راستیی رێگە ئەندازییەکان بۆ دەرخستنی ریشە و سێ جا.

(١٣) نامەی کێشەکانی ماتماتیك .

(١٤) نامەی کورتەیەك لە فیزیکییەکان .

(١٥) نامەیەك بۆ روونکردنەوەی زیجی مەلیکشاهی .

(١٦) نامەی (سیاسەتنامە) ی نیزامەلمەلك: بە هاوبەشی یان یارمەتی/ بە فارسی.

(١٧) شاکارەیلی حیکمەت .

(١٨) نامەی میعراجیە .

(١٩) نامەیەك بۆ تۆژینەوەی مانای هەستیی .

(٢٠) نامەیەك سەبارەت بە رووداني خێرو شەڕ

(٢١) نامەیەك بۆ کەشفی راستیی نەورۆز/ بە فارسی

(٢٢) نامەیەك سەبارەت بە زانستی کوللییاتی هەستیی/ بە فارسی

(٢٣) پاچڤەی خوتبەی غەڕڕا (یەکتاپەرستیی) ئیبن سینا بۆ فارسیی.

(٢٤) وەسیەتنامە

(٢٥) تعبيرالمنام (راڤەی خەون)/ ساغکردنەوەی: د. عەبدولمونعیم حەفنی

(٢٦) شیعرە عەرەبییەکانیی، کە (٩ پارچە) م تا ئێستا دۆزیوەتەوە.

(٢٧) چوارینە فارسییەکانیی، کە لە دەوروبەری (١٨٠ چوارینەی رەسەن و خەییامی ئاساییە) لەگەڵ چامەیەك و دوو پارچەدا .

هەندێك لە باسکاران لیستەکە دەگەیەننە (٣٠ ناونیشان)! کەچی پتر لەو بەرهەمانەی کە مامۆستا رەحیم رەزا زادە مەلیك تەحقیقی کردوون ، بە دەست

نەکەوتووە... هەڵبەتە هەندێکیان فەوتاون ، یا هێمان بزرن و، لە هەندێ سەرچـاوەدا دووناونیشانی کەمێك جیاواز لەم نامە یا لەو نامەیە بەرچاو کـەوتوون ، کـە ئەمــە وادەگەیەنێت دووجـار حیسـاب کـراون، بـەڵام تـا ئێسـتاکە هـەر ئـەو بەرهەمانـە دەستکەوتوون کە لە (دانشنامەء خیّامی) بە ساغکردنەوەی رەحیم رەزا زادە مــەلیك بڵاوبوونەتەوە، بەڵام هەموو شیعرە فارسی و عەرەبییەکانی تێدا نیە .

✻

لەکۆتایی ئەم تۆژینەوەیەدا پێویستە ئەم حیکایەتەی خوارەوە بگێڕینەوە(کە چەندین جار ئەم حاڵەتە دگەڵ دانەری ئەم کتێبەدا روویداوە):

**" دەگێڕنەوە دەڵێن کۆڵکە زانایەك هەموو رۆژێك بەرلە رۆژ هەڵات دەچووە لای خەییام و وانەیەکی حیکمەتی لەلای دەخوێند، کەچی لە نێو خەڵکدا بەخراپی باسی دەکرد...جا عومەر کە ئەمەی پێ دەگاتەوە ، تیپێـك دەهـۆڵ کـوت و زوڕنـا ژەن خڕدەکاتەوەو لە ماڵەکەی خۆیدا دەیانشارێتەوەو، کاتێ کابرای فەقیە وەکو جاران دێ بۆ وانە خوێندن ، ئەمریان پێ دەکات دەهۆڵ لێدەن و زوڕنا بژەنن ، ئیدی خەڵکی لە هەموو لاویەکەوە دێن و خڕدەبنەوەو، عومەر ئەڵێ :**

**- ئەی خەڵکی نیشابوور، ئەمە زاناکەتانە کە هەموو رۆژێك لەم کاتـەدا دێـت و، زانستم لێ وەردەگرێت ، کەچی لەلای ئێوە بەو جۆرەم باس دەکات کـە هــەمووتان دەیزانن ، جا ئەگەر ئەوەم کە ئەو دەیلێت ، بۆچـی زانسـتەکەم لێ وەردەگرێـت ، ئەگەر وەهاش نیم ، بۆچی بەخراپە باسی مامۆستاکەی خۆی دەکات؟ !"**

# دەربارەی چوارینە

بەشێوەیەکی گشتی ، پەیدابوون و سەرهەڵدان و بەردەوامیی شیعری ئێرانی (بە فارسی) لە ڕووی فۆرم و ناڤەڕۆکەوە، بەم قۆناغانەدا تێپەڕیوە: (شیعری لیرکی) لە سەردەمی روودەکیدا ، (داستان) لە سەردەمی فیردەوسیدا ، (چوارینە) لە سەردەمی خەییامدا ، (مەسنەوی لەسەردەمی مەولانا جەلالەددین و، (غەزەل) لەسەردەمی حافزی شیرازیدا.. هەڵبەتە لەگەڵ هەندێ تێکەڵاوبوونی بەرچاوو نابەرچاو لەو سەردەمانەدا. زانراویشە کە سەدەی شەشەمی کۆچی بە سەردەمی بڕەوی چوارینە دەژمێردرێت ، بەڕادەیەك کە عەتتاری نیشابووری کتێبێکی سەربەخۆی بۆ نزیکەی دوو هەزار چوارینەی خۆی بەسەرناڤی (موختارنامە) تەرخانکردووە.

جا زاراوەی (چوارینە) ی کوردی بەرانبەری (رُباعی) فارسی و (رُباعیّە) ی عەرەبی و (چهار قاش) ی هندی و(**quatrain**) ئینگلیزییە .

هەڵبەتە پێشەکی پێویستە (هونەرو ماهییەتی چوارینە) دیاری بکەین ، ئەوجا بێینە سەر باسی چوارینەکانی خەییام ، ئەویش بە شێلەگیریی تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی پەیجۆرانی پسپۆر ، کە دکتۆر سیرووس شمیسا(**ل :** ١٩٤٩) سەرقەتاریانە لە ئێرانداو، دکتۆرە ئیسعاد عەبدوولهادی قندیل و دکتۆر محەممەد نوورەددین عەبدولمونعیم ، لە عەرەبدا، کە چوارینە بەهونەرێکی رەسەن و گرنگی هونەری شیعری فارسی دەزانن ، چونکە زادەی دەستکاریی کێشە عەرەبییەکانە

لەلایەن ئێرانییەکانەوە ، کە کێشەکەیان لە بـەحری (هـەزەج) ـەوە دەرهێنـاوە و(٢٤ تەرح = جۆر) یان لێ هەڵێنجاوە، کە بەسەر هەردوك (درەختی ئەخرەب و ئەخرەم) دا دابەشبوونە .

چوارینە لەرووی فۆرمەوە لە دوو بەیت پێکدێت ، بۆیە بە فارسی (دووبـەیت) یـش پێ گوتراوەو، چونکە لە چوار نیوە بەیت پێکدێت ، (چوارینە) ی پێ گوتراوەو نـاوی دیکەشی هەن : (تەرانە)،(چهار بەیتی = چواربەیتی) و (چهارگانی = چـوارلا) و دوو بەیتەکانی چوارینە بریتییە لە چوار نیوەبەیتی (پـاژ) کـە (هـاوکێش و هاوسـەروان) بەڵام هەندێ جار نیوەبەیتی سێیەم سەرواکەی وەل سەرواکانی سێ نیوەبەیتەکـەی تـر ناگونجێت و، بەو چوارینەیە دەگوترێ (چوارینەی خەسیو= خەسیاگ) نەك (چوارینەی تەواو) .

هەندێك پێیان وایە چوارینە زەحمەتترین قاڵبی شیعرییە ، چونکە  شاعیر دەبێ جێی هزرۆکەیەکی دیاریکراوو مانایەکی تازە لەو قاڵبە تەنگ و بچـووکەدا بکاتـەوەو لـە هەمان کاتدا پابەندی کێشە تایبەتییەکەی بێت ، بە گوزارشتی د. عەبدەلمونعیم :

" چمان دەریایەك بڕێژیتە نێو بوتڵێکەوە !".

کێشی باوی ئەم قاڵبەش رسـتەی "لا حـول ولا قـوّە الا بـاللە" یـە . ئەمـەش لـە زوحافاتی (ترازانەکانی) بەحری هەزەجی هەشـتەکییە : (مفعـول مفـاعلین فـع) کـە بریتین لە : (هەتم ، زەلەل ، جب و بـەتر) خـۆ ئەگـەر پاژەکـان (نیـوە بەیتـەکان) ی چوارینەیەك لەسەر کێشی تر بن ، ئەوا پێ دەگوترێت (دووبەیتی) مینـا شـیعرەکانی بابا تاهیری لوڕی هەمەدانی .

بە چوونگەی بەندە درووست تر ئەوەیە بڵێین (دووبەیت) بەخۆی (تەرانە) یە ، بگـرە وێنەی تەواوی ئەو شیعرانەیە کە لە (١١، ١٢ بڕگەی سـیلابی) پێکهاتوونـە و، پـێش

سەردەمی ئیسلام لەئێراندا بە گۆرانی و سروود گوتراون و، لە ئاڤێستادا رەگـاژۆن و، پاشڕا بە (فەهلەوییات) ناویان دەرکردووەو بوونەتـە بـاو، نـەمازە لـە (کوردسـتان ، لوڕستان ، ئازەربایجان و خۆراسان) دا و بەشی کوردستان لە فەهلەوییاتدا لـەم بەیتـە رووندەبێتەوە :

**" لحـن اورامـان و بیت پهلـوی**

**زخمەی رود و سماع خســروی"**

**واتە :**

ئاهەنگی هەورامان و بەیتی پەهلەوی

پێـژەنی عوود و ســەمای خوسـرەوی

ئەمانەش شاعیرە بەرجەستەکانی فەهلەوین : کەمالـەددین پنـدار رازی کـورد (م : ١٠١٠ز)، بابا تاهیر هەمەدانی کورد (م : ؟ ١٠٧٥ ز)، پوور فرەیـدوون کـورد (نـاڤینی سەدەی ٦ ك = ١٢ ز) و فایز دەشتی (١٨٣٤- ١٩١١ ز)

بەم پێوەدانگە چوارینەو دووبەیتی لـە رووی فـۆرم و سـەرواوە وەك یـەکن ، بـەڵام لەرووی کێشەوە جیاوازن .

زۆربەی باسکاران جەخت لەسەر ئەوە دەکەن کە هۆزانڤان روودەکی سەمەرقەندی (م : ٩٤٠ ز) یەکەمین کەس بووە کە کێشی چوارینەی دۆزیوەتـەوە، ئـەوەش کاتێـك لـە باخچەیەکدا لە شاری غەزنە پیاسەی دەکردو، تووشی کۆمەڵێك منـداڵ هـاتبوو کـە گەمەیان بە گوێز دەکردو، گوێی لە یەکێکیان بووە ، کە بەدەم غلکردنەوەی گوێزێـك بۆ ناو چاڵێك هاواری دەکرد : " غلتان غلتان همی رود تابن کو= غل غل بەرەوە تـا بن چاڵەکە" جا روودەکی ئەم ئـاوازوو ریتمـەی زۆر بـە دڵـدا چـووەو کـاری لەسـەر

کردووه، تا کێشەکەی و تەرزەکانی بەتەواوەتی کۆنترۆڵکردووە و، پاشـان نـاوی نـاوە (تەرانە) .

وەل ئەمەشدا پێشەنگانی تر پێشی روودەکی چوارینەیان هۆنیوەتــەوە وەك : صـایغ بەلخی (؟!) ، شەقیق بەلخی (م : ٧٩٠ ز) و بایەزیدی بسـطامـی (م : ٨٧٤ ز)، هــەروەها شاعیرانێکی دیکەی وەچەی روودەکی وەك : شەهید بەلخی (م : ٩٣٦ ز)، ئـەبو شـکور بەلخی (م : ٩٤٤ ز) و، شـاعیرانێکی وەچـەکانی پاشـتر وەك : دەقیقـی (م : ٩٧٥ ز) و تاهیر چەغانی (م : ٩٨٧ ز) و کەسایی مەروەزی (م : ١٠٠٠ ز)

لێرەشدا دەبێ ئاماژە بۆ رایەکی تر بکەین ، کە (**بـوزانی**) رۆژهەڵاتناسـی ئیتـاڵی یەکێکە لە نوێنەرانی و پێی وایــە ئەسـڵی چـوارینە دەگەرێتــەوە بـۆ ئاسـیای نـاڤین (تورکستان و چین) کە زێدی (تانکا) و(هایکۆ) یە و، لێکچوونێکی ئەوتۆ لـە نێـوان شێوە کورتەکانی ئەم جۆرە هۆزانانە هــەس ، بــەڵام ئــەم چـوونگەیە لاوازو سســتە ، چونکە کێشەکانی (تانکا) و(هایکۆ) برگەیین و، چوارینە کێشی عەروزییــە . بگــرە لەوەیــە (تانکــا) و(هــایکۆ) لــەژێر کاریگــەریی ئاڤێســتا و فەهلەویاتــدا بوونــە ، پشتەوانەشم لەم چوونگەدا رای باسکاری تاجیکی پرۆفیسۆر(رەجەب ئەمانۆڤـــ)  ــە ، کە پێی وایە چوارینە یەکێکە لە ژانرە بنەرەتی و دێرینەکانی هۆنراوەی مەردمیی و لە رووی ناوەرۆکەوە زۆر دەوڵەمەندەو لە رووی فۆرمەوە تەواوترین ژانـری لێرکییــە ، کە لە ســەدەی دەیــەمینی زایینییــەوە هاتۆتــە تۆمــارو نووسـین و، لــە ئــەدەبییاتی تاجیکیدا پلەوپایەی بــاڵای وەرگرتــووەو، بگــرە پانتــایی جوگرافیشــی زۆر بــەرین و فراوانەو، هەر لە دێر زەمانەوە : ئاسـیای نـاڤین ، ئێـران ، ئەفغانسـتان و پاکسـتان گرتۆتەوە و دەگرێتەوە.

ئینجا بەگشتی سۆفییەکان بایەخیان بە هۆنینەوەی چوارینە داوە بەهۆی دابینبوونی بڵاوبوونەوەی بەئاسانی ، نەمازە ستران ئاساییە و قاڵبەکەی بۆ ناوەڕۆکی سۆفییانەو عیرفانی گونجاوە ، هەڵبەتە سەنائی و عەتتار و مەولانا جەلالەددین بەرجەستەترین میناکن (نموونەن) لەم بوارەدا. هەروەهاش بەلای فەیلەسووف وزاناکانەوە بۆ گوزارشت و دەربڕینی هزرۆکەکانیان ، بەڵام بێ تەماحی کۆگوتاری وەك : ئیبن سینا، خەییام و بابا ئەفزەڵ کاشانی و نەصیرەددین تووسی .

شاعیرانی دانەری شیعری هەمەجۆر مینا : غەزەل ، ستایش ، پەندیاریی ، فەلسەفە ، سۆفیاتی ، کۆمیدی ، رەخنەی کۆمەڵایەتی و ئیرادی سیاسییان لە قاڵبی چوارینەدا هۆنیوەتەوە ، بەڵام خەییامی پەندیار قاڵبی چوارینەی هەڵبژاردووە ، چونکە بچووکترین قاڵبە لە قاڵبە شیعرییەکان و لەبارترینیانە بۆ بابایەکی زانای سەرقاڵ و نوقمی کاروباری زانستیی و نەپەرژاو بۆ خۆتەرخانکردن بۆ کاروباری ئەدەب ، تا بیکات بە دالدەو پەناگەیەك بۆ گوزارشتکردن لەو هەست و سۆزو گوداز هزرو بیرانەی لە دڵ و دەروونیا دەپەنگانەوەو بەمێشك و خەیاڵیدا دەبوورین و، چوارینەکانی پتر فەلسەفەئامێز بوون . ئەمەش ئەوە دەبەڵگێنێ ، کە خەییام میناك مەعەڕڕی توانی شیعرو فەلسەفە پێکەوە بسازێنێت ، کەچی لە دێر زەمانەوە ئەفلاتوون (٤٢٧-٣٤٧ پێشی زایینی) وتوویەتی : " لەنێوان شیعرو فەلسەفەدا ململانێیەکی دێرین هەیە"

هەڵبەتە خەییام خۆی بۆ هونەری شیعر تەرخان نەکردبوو، بۆیەش کەم بێژ بوو، بەڵام زمان حاڵی ، چمان گوزارشتی نیما یوشیجە ، کە ئێژێ : " ئەز ئەم چوارینانەم نەهۆنیوەتەوە ، بۆ ئەوەی بلەزنووسی بکەم ، بەڵکو بۆ ئەوەی تا بە ئاسانی وەسفی

حاڵ و ڕەوشی خۆم لەم ژیانە تەڵەدا دەربڕم . ئەگەر چوارینان نەبان ، ڕەنگـە تووشـی تالووکە ببایام..."

زۆر لە شاعیرانی کۆن لە بواری ئەم هونەرەدا گۆی هونەریان بردووەتەوە ، لەوانە : ڕوودەکی سەمەرقەندی ، باباتاهیری هەمەدانی ، ئەبووسەعید ئەبوولخەیر، عەبدوڵڵا ئەنصاری (١٠٠٥- ١٠٨٨) ، عومەر خەییام ، مەهستی گەنجەوی ، عەتتاری نیشابووری ، جەلالەددین مەولەوی ، بابا ئەفزەڵ کاشانی ، سەلمان ساوجی و سەحابی ئەسترئابادی...بەڵام لە سەردەمی نوێدا تەنیا چوار- پێنج شاعیر لەم بوارەدا هەڵکەوتوون ، ڕەنگە حوسێن نەخەعی (١٨٩٤- ١٩٧٧) تاقە شاعیر بێت کە شایستەی ئەوە بێت بەچوارینەکانی لە ئاستی مەزنترین شاعیرانی دێرینی ئێرانی نزیکببێتەوە ، هەڵبەتە دەبێ ئاماژە بۆ شاعیرنی هاومێژی دیکەش بکرێت میناك :

فەڕڕوخی یەزدی (١٨٨٩- ١٩٣٨)، نیـــما یوشـــیج (١٨٩٧- ١٩٥٩)،(مەهدی سوهەیلی (١٩٢٤- ١٩٨٧)، فرەیدوون موشیری (١٩٢٥- ٢٠٠٠) ، سیاوش کەسرائی (١٩٢٧- ١٩٩٧) ، مەنصوور ئەوجی (ل : ١٩٣٨)، لایـــــق شـــیرعەلی (١٩٤١-٢٠٠٠) ، قەیصەر ئەمین پوور(١٩٥٩- ٢٠٠٧) ، شاپوور پساوەند ، ئیرەج زەبەردەست (ل : ١٩٧٤) و پووران فەڕوخزاد .

# چوارینەکانی خەییام

## لەزمانی عەرەبیدا

پێم وایە (بەش بەو سووکە زانیاریەی خۆم) قازی و شاعیر نیزامەددین ئەصفەهانی (م : پێش ١٢٨١ ز) کە لەژێر کاریگەریی خەییامدا شیعری بە هەردوك زمانێن عەرەبی و فارسی داناوە ، یەکەم کەسە کە چوارینەیەکی مشتومڕئەنگێزی فەلسەفیی خەییامی بۆ زمانی عەرەبی وەرگێڕابێت ، بگرە بە چوار چوارینە بەرپەرچی داوەتەوە ، کەچی پێدەچێت تینوویەتی نەشکابێت ! ئەمەش چوارینەکەی خەییامە وەرگێڕانە کوردییەکەی :

" دارندە چو ترکیب چنین خوب آراست
باز از چە سبب فگندش اندر کم و کاست
گر خوب نیامد این بنا عیب کی راست؟
ور خوب آمد خرابی از بهر چراست ؟"

چکو کردگار پێکهاتەی ئافریدەیێن خەملاندووە
سا ئەڕا کەموکووڕییانێکی تێخستووە؟
ئەگەر ئەم وێانە کرێتن ، ڤەهێتیی کێیە؟
ئەگەر جوانیشن، هاژنینیان لەبەر چییە؟

ئەصفەهانیش بەم جۆرە وەریگێڕاوە بۆ عەرەبی :

**" الصّانعُ إذ أحسنَ في التركيب**
**لمْ يُخرِجُ نظمه عن الترتيب**

**إنْ ســـــاء، فمــنْ أحــقّ بالتــثريــــب**
**أو أحسنَ ، ما الحكمـــةُ في التخريب؟"**

**ئەمەش یەکێکە لە چوارینە ڕەخنەئامێزەکانی :**

**" ما للخيّــام لــجَّ في التــأنيب**
**للخيمة قوّضوا لدى التطنيب**
**لابــدّ لذي الخيّام أن يقــلعـــها**
**مهما حفــر الجيوشَ للتشــريب"**

**واتە :**

" بــۆ خەییــام وڕکی بــۆتە سەرزەنشتخوازی
دەوار لە کاتی کۆچکردنــا دەپێــچرێــتــەوە
دەبێ دەواردار مێــخەکان هەڵکەنێ گەرچی
چمان حەوزچەی بۆ ئاوادانی درەخت کردووە"

**وادیارە شێخ بەهائەددین محەممەد عاملی (١٥٤٦- ١٦٢٢ ز) خودانی کتێبی (کەشکۆڵ) ی بەناوبانگ ، کاریگەری خەییامی بەسەرەوە بووەو، دووەم کەسە لەو مەیدانەدا و، ئەم چوارینەیەی وەرگێڕاوە:**

گاويست در آسمان و نامش پروين
يك گاو دگر نهفته در زير زميــن
چشم خردت گشاى چون اهل يقين
زير وزبر دو گــاو مشتى خر ببين"

**" و ثوريــن حاطا بهــذا الورى**
**فــثورُ الــثريّــا و ثــورُ الثــرى**
**ومنْ تحت هذا و منْ فــوق ذا**
**حــمــيـــرٌ مســرّحــةٌ في قِــرى"**

**واته :**

" گایــەك لە ئاسمانە بە ناوی پەروین
گایەکی دی پەنهانە لە ژێری زەمین
چاوی ئاوەزت وازکە لەرووی یەقین
لە ژێــرو بانی دووگا کەرگەلێ ببین "

لە سەردەمی نوێدا دەسپێکی وەرگێڕانی چوارینەکانی خەییام بۆ زمانی عەرەبی بۆ ڕێڤگەی (سەرەتای) سەدەی بیستەم دەگەڕێتــەوە ، لــێ لــە زمــانی ئینگلیزییــەوەو، یەکەم پاچڤەوان ئەحمەد حــافزِ عــەوەزِ (١٨٧٧- ١٩٥٠) بــووە کــە (٩ چــوارینە) ی بــە پەخشان وەرگێڕاوەو، لە وتاری (شاعیرانی فارســی : عومــەر خــەییام) دا لــە (المجلّــە المصريّە) لە سالّی (١٩٠١) پەخشبۆتەوە. کەچی لەو مێژووە و پێهەل...دەیان پاچــڤەی چوارینەکانی خەییام و، سەدان گوتارو لێکۆلّینەوەی نووســراو وەرگێــڕدراو دەربــارەی خەییام و نامە زانستی و فەلســەفی و چــوارینەکانی بلاّوبۆتــەوە، بگــرە نزیکــەی (٨٠ پاچڤە) ی هۆنراوەیی و پەخشانیی تەواو ناتەواوی چوارینە کانی خەییام پەخشــبۆتەوە و، ئەمانەی خوارەوە ناوی ئەو پاچڤەوانەن ، کە لە زمــانی فارســییەوە چــوارینەکانی خەییامیان وەرگێڕاوە چ بە هەلّبەست (هۆنراوە= **قريض** = **نظم**) و چ بــە پەخشــان و، بەگوێرەی سالّی بلاّوبوونەوەی پاچڤەکانیان:

× مستەفا وەهبی تەل (عەرار)(م : ١٩٤٩) : پەخشان (١٦٩ چوارینە) ١٩٢٢- ١٩٢٥

× **محەممەدوهاشمی ئەلبەغدادی :** هەڵبەست (**؟!** چوارینە) ١٩٢٣ ز

(٢٠ چوارینەم بینیوە/ **ج.ز**)

× ئەحمەد رامی (م : ١٩٧٨) : هەڵبەست (**١٦٨ چوارینە**) ١٩٢٤

× جەمیل صدقی زەهاوی (م : ١٩٣٦): پەخشان و هەڵبەست (**١٣٠**) ١٩٢٨

× **محەممەد فوراتی (**١٨٨٠- ١٩٧٨**) :** هەڵبەست (**؟!**)

× ئەحمەد صافی نەجەفی (م : ١٩٧٧) : هەڵبەست (**٣٥٢**) ١٩٣١

× ئەحمەد حامد صەڕاف (١٩٠٠- ١٩٨٥) : پەخشان

(**١٥٢**) چاپی یەکەم ١٩٣١ و (**٢٠٠**) چاپی سێیەم ١٩٦٠

× ئیبراهیم ئەلعورەییز (١٩٠٨-٢٠٠٢) : هەڵبەست

(**١٥٢**) چاپی یەکەم ١٩٦٥ و چاپی پێنجەم (**١٨٨**)١٩٩٧

× **تاڵب حەیدەری** (**ل :** ١٩٢٨): هەڵبەست (**١٥٩**) ١٩٥٠

× عەبدولحەق فازڵ (م : ١٩٩٢): هەڵبەست (**٣٧٧**)

چاپی یەکەم ١٩٥١ و(**٣٨١**) چاپی دووەم ١٩٦٨

× **مەهدی جاسم شەمماسی (م :** ١٩٧٩**) :** هەڵبەست (**١٧٨**) ١٩٦٤

× **حیکمەت فەرەج بەدری :** (**؟!**) (**١١٠**) ١٩٦٤

× ئەبولنەصر موبەششیر تەرازی (١٨٨٦- ١٩٧٧) : پەخشان (**٤٠**) ١٩٦٧

× **محەممەد بن تاویت** (١٩١٨- ١٩٧٤) : (**؟!**) (**١٥٠**) ١٩٨٥

× **محەممەد** نوورەددین عەبدولمونعیم : پەخشان (**١٧٨**) ٢٠٠٥

× صاڵح جەعفەری (م : ١٩٧٩): هەڵبەست (**٤٣٥**) ٢٠٠٧

× **محەممەد** صاڵح قورق (**ل :** ١٩٣٦): هەڵبەست (**٢٠٠**) ٢٠٠٨

× جـــەلال زەنگابـــادی (**ل** : ١٩٥١): پەخشـــاهۆنراو (**نـــثم** = هـــۆنراو+ پەخشـــان) (٧٤چوارینەی رەسەن + ٢ چامە فارسی + ٧ پارچەی عەرەبی) ٢٠١٠
**( پاچڤەکانی ئەوانەم نەبینیوە ، کە بە فۆنتی رەش ناوەکانیان پیتچن کراون)**

بەناوبانگترین پاچڤەی هەڵبەستڤانیی چوارینەکانی خـەییام دووانـن هـی (ئەحمـەد رامی) و (ئەحمەد صافی نەجەفی) ین ، بەڵام بەپێی زانیاریم و بەراوردکردنی زۆربەی پاچڤە باشەکان وەل دەقی فارسی چوارینەکانی خەییامدا ، دەتوانم بڵێم باشترین سـێ پاچڤەی هەڵبەستڤانیی (هۆنراوەیی) هی ئەم هۆزانڤانـەن : صـافی نەجـەفی (١٨٩٧- ١٩٧٧) و عەبدولحەق فازڵ (١٩١١- ١٩٩٢) و صالّح جەعفـەری (١٩٠٨- ١٩٧٩)، کەچـی پاچڤەکەی رامی (١٨٩٢- ١٩٧٨) وەك هەڵبەستی لیرکی یەکجار باڵایە ، بەڵام لەڕووی ناوەرۆکەوە لـە وردیـی و ئەمانەتدارییـەوە زۆر دوورە ، کەچـی پاچـڤەکەی نەجـەفی هاوتای باشترین پاچڤەی رۆژهەڵاتی ورۆژئاواییە ، بەو رادەیەی کە کەڵە زانای ئێرانی صەدرو لئەفازڵ لـە بارەیـەوە (بـە فرەڕوویـیـەکی زەقـەوە !) نەجـەفی دوانـدووە : " خەریکە بێمە سەر ئەو باوەڕەی کە خـەییام چـوارینەکانی خـۆی بەهـەردوك زمـانێن عەرەبی و فارسی داناوەو، نوسخە عەرەبییەکە ونبووەو تۆ دۆزیوتەتەوەو نـاوی خـۆت پێوە ناوە ! " بگرە (بەهار) ی شای هۆزانڤانانیش دەربارەی گوتویەتی :
" هەندێ وەرگێڕان وێڕای دەقاندەی یەکجار دەگـەڵ ئەسـڵدا، لـەڕووی رەوانبێـژی و شێوازەوە باڵاترە..." و، دوو چوارینەی بۆ نموونە هێناوەتەوە.

پێم وایە پاچڤەکەی جەعفەری ، تا رادەیـەکی بەرچـاو هاوتـای ئـەوەی نەجـەفی و عەبدولحەق فازڵە ، بگرە لە چەندین شوێندا، لەوردیی و ئەمانەتدارییدا دەیانبەزێنێ ، سەرباری ئەوەش کە زۆرترین ژمارەی تا ئێستا(٤٣٥) لەو چوارینانەی کە دراونەتە پاڵ خەییام وەرگێڕاوە و، رێژەیەکی بەرچاوی چوارینە رەسەنەکانی خەییام تێدایە ، کەچی

رامـی (١٦٨ چـوارینه) ی وەرگێـڕاوە و ڕێژەیـەکی زۆر کـەمیان رەسـەنە ، تەنانـەت نەجەفیش لە کۆی پاچڤەی (٣٥٢ چوارینە) ڕێژەی چوارینە رەسەنەکانی خـەییام تێـدا کەمە !

هەروەها پاچڤەکەی عەبدولحەق فازڵ کە (٣٨١ چوارینە) یە هیچی کەم نییە لەو سێ پاچڤەیە لەڕووی شیعرییەتەوە ، بگرە زۆر ئەمانەتـدارەو ژمـارەی چـوارینەی رەسـەن تێدا لەوەی نەجەفی زیاترە ، بـەڵام لـە هـەمان کاتـدا ڕێـژەی (چـوارینە نارەسـەن و ئەبیکۆڕی و کوفرئامێزەکان) ی بەرزە !

ئینجا جێی خۆیەتی ئاماژەیەك بـۆ پاچـڤە هەڵبەسـتڤانییەکەی شـاعیر موحەممـەد صالّح قورق بکەین ، کە بریتییە لە (٢٠٠ چوارینە) و ڕێـژەی چـوارینە رەسـەنەکانی خەییام تێدا کەمە ، سەرباری ئەوەش پاچـڤەیەکی زۆر دەڵـب و فشـۆڵە و سـیخناخە (حەشوکراوە) یە ، بەڕادەیەك کە هـەر چـوارینەیەکی فارسـی بۆتـە هەشـتینەیەکی درێژکراوەو ژمارەی وشەکانی بۆتە دوو چەنانە ! ناڤەرۆکە خەییامییەکەشی کاڵبۆتەوە ، بگرە ونبووە ! کەچی دەبوایە شاعیرو پاچڤەوانێکی توانـا وەك قـورق ، کـە دەیـان ساڵە سەرقاڵی لێکۆڵینەوەی چوارینەکانی خەییامە بەزمانێن : عـەرەبی ، فارسـی ، ئۆردو و ئینگلیزی ، دەبوایە زۆربەی کەموکووڕی و کاڵوکرچی پاچڤە هەڵبەستڤانیی و پەخشانییەکانی پێشتر ببەزێنێت . لەگـەڵ ئەمەشـدا خەییامناسـی عـەرەبی نـاودار یووسف بەککار پێشەکییەکی بـۆ پاچـڤەکەی ئـەلقورقی نووسـیوە ، بەزێدەڕۆییـەوە کەوتۆتە ستایشی و هەوڵیداوە بەسـەر ئـەو پاچـڤە هەڵبەسـتڤانیی و پەخشـانییانەی پێشتردا پەسەندی بدات ، بگرە بیانوویشی بۆ هێناوەتـەوە گوایـە قـورق لـە قـاڵبی (المربعــە= چوارخشـــتەکی) دا دایڕێـــژاوە ، هەرچـــەندە دەڵـــبی و شاشییەکەشـــی دەرخستووەو دەڵێت :

"پاچڤەکە **Covert** پەیوەندیخوازو مەعنەوی و دەڵبە ، دەقاندەقی نیە . ئەمەش لە مەرجەکانی قاڵبی (مربّعە) یە کە پاچڤەوان تا رادەیەك بەسەریا زاڵە ، لە زۆربەیاندا کرۆك و جومگە ئەسڵی و تەوەرە ناوەندیی و هزرۆکە سەرەکیەکانی پاراستوون و، لێی هەڵێنجاون و، شیعریانەیە و دوور لە هەر دەستکردیی و سەنعەتبازیی و دوورکەوتنەوەیەك لە تەوەرە و، بەنێو کرۆك و جەوهەریاندا لە شەقەی باڵی داوە"

مەخابن کە فڕینە هەڵبەستڤانییەکەی مام قورق لەسەر حیسابی بزربوونی ناڤەرۆك و قاڵبی چوارینەکانی خەییامە ! بەڕای بەندە (بوستانی) بە حەوتینەکانی (سُباعیّات) گەرچی لە زمانی دووەمەوە (ئینگلیزی) چوارینەکانی خەییامی وەرگێڕاوە ، زۆر لە قورق سەرکەوتووترە !

بەگشتی پتر لە نیوەی ئەو چوارینانەی خەییام کە پاچڤەی هەڵبەستڤانیی باشیش کراون ، لە چەندین هەڵەییێن ماناو نێوەڕۆکی دەق بەدەر نین ، چونکە پاچڤەوانەکان زۆر بەباشی لە دەقەکان حاڵی نەبوونە ، ئەوەندەش پەڕان و تێئاخنین و لادانیان تیاکردوون ، کە لە بناغە فارسییەکانیان دوورکەوتوونەتەوە ، تەنانەت هەندێ جار جیابوونەتەوە ! چمان کۆمەڵە چوارینەیەکن بە باندۆری چوارینەکانی خەییام هۆنرابنەتەوە! بۆیەش مایەی گومڕایی و چەواشەکردنن و بەکاری ئەوە نایەن بکرێن بە مەحەك و پێوەر بۆ لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندنی هزرو فەلسەفەی خەییام ، هەروەها بەکەڵکی ئەوەش نایەن بکرێنە رێڤگەی پاچڤە بۆ زمانێکی تر ، بگرە ئەگەر بەبێ ئاماژەو ئاگاداری وەرگێڕدرێنەوە سەر فارسی ، هیچ ئیرانییەك لە سەدا بیست و پێنجیان ناناسێتەوە ، کە لە چوارینەکانی خەییامن !

بەڕاستی زۆربەی پاچڤە هەڵبەستڤانییەکان لە قەرەوێڵەکەی **برۆکرۆست** دەچن ، مادامەکی پاچڤەوان هەموو خەمێکی ئەوە بێت کە " قسەیەکی کێش و سەرواداری

مانابەخش " لە زمانی دووەمدا ئەنجام بـدات و، وردیـی گواسـتنەوەی واتـای دەقـە ئەسڵییکەی بەلاوە لاوەکی بێت ! تەنانـەت زۆر جـاریش پاچـڤەوان ناچـاربێت لەبـەر خاتری چاوی رەشـی کـێش و سـەروادا وشـەی ناشـیرین وەك : (قرقـف)، (صـرخد)، (خندریس)، (عقار)، (ترياق)، (جريال) لەجیاتی : (خمر، راح، شمول ، صهباء ، حميّا و مدام...) بەکاربێنێت ، هەڵبەتە پاچڤەوانانێکی هەڵبەسـتڤانیی سـەرکەوتوویش وەك نەجەفی و عەبدولحەق فازڵ وەهایان کردووە !

بەداخەوە (وێڕای هەوڵی زۆرم) پاچڤەکەی هۆزانڤان (جاسم مەهدی شەماسی) م بـە چنگ نەکەوت کە (١٧٨ چوارینە) یە و چەند دانەیەکم خوێندۆتەوەو، پێم وایە لەوەیـە پاچڤەیەکی هەڵبەستڤانیی باش بێت ، کەچی پاچڤەکەی جەمیل صدقی زەهـاوی بـە پەخشان و بە هەڵبەست لاوازە !

لەم ئایندەدا پێداچوونەوەیەکی دوورودرێژم دەربارەی ئـەو وەرگێڕانانـە دەبـێ ، لـێ لێرەش دەبێ مەبەستەکەم پتر روونبکەمەوە.

ئاشکرایە کە شیعری هەڵبەست (هۆنراوە) سێ رەگەزی سەرەکی هەس کـە (بونیـادو ماناو ومۆسیقای پێکەوە جۆشیانخواردووە) هەڵبەتە گواسـتنەوەی ئـەم سـێ رەگـەزە پێکەوە بۆ زمانی دووەم یـەگجار ئەسـتەمە چ لـە پاچـڤەی هەڵبەسـتڤانیی و چ لـە وەرگێڕانی ناهەڵبەستڤانییشدا، بۆیە ئەرکی (سەرەتاو بنەتای) پاچڤەوان ئەوەیـە کـە پابەنـدی گواسـتنەوەی ناڤـەڕۆك (واتـا) بێـت بـە وردیـی و ئەمەکـداری ، ئـەگینا پاچڤەیەکی پەسەند ( وردو زۆر نزيك لەدەقەکەوە ، ئەگەر نـەڵێین دەقـاودەق) نایەتـە دی ، چونکە زمانەکان لەخەسڵەتە بونیادیی و کەلتووریەکانیاندا جیاوازن . ئەمـەش ئەوە دەگەیەنێت کە پاچڤەوان (ئەگەر لە یەکێك لە زمانی یەکەم و دووەمدا، یان لە هەردوکیاندا) شاعیریش بێت ، نـابێ بـە تـۆبزی و خـورتی کـێش و سـەروا بەسـەر

پاچڤەکەیدا بسەپێنێت ، بەڵکو جلەوی ئازادی بۆ شـلبکا، چـونکە لەگینـە پاچـڤەی هەڵبەستڤانیی یان سەروادار لە هەندێ حاڵەتی ریزپەڕدا خۆبـەخۆ بێتـەدی ، زۆریـش باشتربێت لەو پاچڤە زۆرەملییانەی کە خەسڵەتەکانی زمانی وشکوبرینگی (ارجـوزە= هەڵبەستی فێرکاریی) و دەستکردیی و سـەنعەتبازیی بەسـەریا زاڵبێـت ، گەشـترین بەڵگەشمان بـۆ پاچـڤە هەڵبەسـتڤانییکان کارەکـانی ئـەم مامۆسـتایانەیە : حوسـێن موجیب میسـری (١٩١٦- ٢٠٠٤)، عـەلی مەنصـوور و چـەندین پاچـڤەوانی دیکـەی چوارینەکانی خەییامـە.. بـەڵێ لـە وەرگێڕانـی هەڵبەسـتڤانییدا دەقـە شـیعرییەکە (لەزمانی یەکەمدا) دەکەوێتە ژێر باری قورسی فۆرم و بونیادی (کێش و سـەروا) لـە زمانی دووەمـدا، هـەنگێ واتاکـەی زەدەدار دەبێـت و، وێنایـەکی دروسـتی روون و ئاشکرای ناڤەڕۆکی دەقە ئەسڵییەکە بە دەستەوە نادات ، ئەگەر بەشێوەیەکی جـوانی لەباریش لەزمانی دووەمدا بێتـە هۆنینـەوە. لەوەیـە لـە هەنـدێ حاڵـەتی ریزپـەڕی دەگمەندا، وەرگێڕانی هەڵبەستڤانیی (تەرجەمەی مـەنزووم) لـەنێوان زمانـە لێکـدی نزیکەکانەوە (ئەوانەی لەیـەك خیزانـە زمـانن) و دراوسـێکان لـەرووی کەلتووریـەوە سەرکەوتن بەدەست بێنێت ، مینا زمانێن : فارسی و کوردی/ ئیسپانی و پۆرتوگالی/ پەنجابی و ئۆردو/ ئوزبەکی و تورکمانستانی .

جێی خۆیەتی لیرەدا بۆ چەند وەرگێڕانێکی ناهۆنراوەیی لەفارسییەوە بـۆ عـەرەبی- کـە بەناهـەق نـاوی وەرگێڕانـی پەخشـانڤانییان لێنـراوە- ئاماژەبکـەین ، لەوانـە (ئەوەندەی بەندە ئاگام لێیە) وەرگێڕانەکانی : ئەحمەد حامد صەڕڕاف (٢٠٠ چـوارینە) یە و دکتۆر محەمـەد نـورەددین عەبـدولمونعیم (١٧٨ چـوارینە) یـە و دکتـۆر محەمـەد غونێمی هیلال (٢٣ چوارینە) یە و، بەڕای بەندە باشترین وەرگێڕان لـە ئینگلیزییـەوە وەرگێڕانەکەی دکتۆر بەدر تەوفیقە و، وامدەزانی وەرگێڕانە پەخشانڤانییەکەی شاعیر

عەرار باشە ، وەلیّ زۆر لاوازە ! کەچی پاچڤەکەی وەدیع بوستانی (١٨٨٨- ١٩٥٤) کە (هەڵبەست) ـە و لە ئینگلیزییەوە و، پاچڤەکەی دکتۆر بەدر تەوفیق کە پەخشانڤانییەو لە ئینگلیزییەوەیە لەوانەی عەرار و زەهاوی و عەبدولمونعیم باشترن !

هەژی ئاماژەیە کە نزیکەی پازدە کتێبی لێکۆڵینەوەی باش دەربارەی خەییام و چوارینەکانی بە زمانی عەرەبی هەس ، ئەمانەش سەرناڤێن گرنگەکانیانە :

× عومەر خییامی حەکیم ، ماتماتیکزان و گەردووںناسی نیشابووری/ ئەحمەد حامد صەرراف .

× شۆڕشی خەییام/ عەبدەلحەق فازڵ .

× لادانی دەمامك لەرووی چوارینەکانی خەییام/ ئەبوو نەصر موبەششیر تەرازی .

× **پاچڤە عەرەبییەکانی چوارینەکانی خەییام/ د. یووسف بەککار.**

× **خەییام و چوارینەکان لە کارەکانی پەیجۆرانی عەرەبدا/ د. یووسف بەککار.**

× وەهمەکان لە نووسینەکانی عەرەبدا دەربارەی خەییام/ د. یووسف بەککار.

× **عومەری خەییام، سەردەم و ژینگە و بەرهەمی/ د. ئەحمەد کەمالەددین حیلمی .**

× ئیمام وحەکیم ، حوججەتولحەق و زانا عومەر خەییام و چوارینەکان/ د. عەبدولمونعم حەفنی .

× رایە فەلسەفییەکانی ئەبولعەلا مەعەڕڕی و عومەری خەییام ، لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکاری/ د. تەغرید زەعیمیان

× دیوانی عومەر خەییام، لێکۆڵینەوەو پاچڤەیەکی پەخشاهۆنراو/ جەلال زەنگابادی .

**(بەداخەوە ئەوانەی بە فۆنتی رەش پیتچنکراون بەدەستم نەکەوتوونە)**

پێم وایە کتێبەکەی باسکاری گرانقدر دکتۆر عەبدولمونعیم حەفنی فراوانترین و قوولترین باسی بابەتیانە و بە ئینسافە دەربارەی خەییام چ وەك زاناو چ وەك

فەیلەسووف و چ وەك شاعیر و، هەروەها کتێبەکەی دکتۆرە تەغرید زەعیمیان (رایە فەلسەفییەکانی مەعەڕڕی و خەییام...)

لێرەشدا دەبێ ئاماژە بۆ فەزڵی ئینتەرنێت ، نەمازە ماڵپەڕی پایەدار (www.al_mostafa.com) بکەم و، پێویستە ئەوەش بڵێم کە لە ماڵپەڕی (www.alkashf.com) فەتوایەکی سەیروسەمەرەی تێکوفراندنی خەییامم خوێندەوە ، کە لەلایەن شێخ محەممەد صالح مونجد (١٩٢٠- ٢٠١٠) دەرکراوە و سەرباری کوفراندنی خەییام ، ئیبن سینایشی (بەشێوەیەکی ناراستەوخۆ) کوفراندووە، بۆ ئەم مەبەستەش پشتی تەنیا بەچەند چوارینەیەکی نارەسن و ئاوەکی و بە پاچڤەیەکی ناوورد بەستووە ، کە بۆ مەقامێکی وا هەستیار دەست نادات و پشتی پێ نابەسترێت و، سەبارەت بە بەرهەمە زانستیی و فەلسەفییەکانی دیکەی خەییام غافڵە ، یاخود خۆی لەگێلی داوە ! ئاری شێخ مونجید ئەوەندە بە دڵنیاییەوە دەدوێ چمان بەخۆی ئەو چوارینانەی لە دەمی خەییامەوە بیستووە !

هەڵوێستی خەییام زۆر روونە سەبارەت بە ئایین لە نامە فەلسەفی و شیعرە عەرەبی و چوارینە راستەقینەکانی و تەنانەت لە چەندین دەستەواژە و رستەو برگەی نامە زانستییەکانیشی ، کە خەییام هێرشی نەکردۆتە سەر یەزدان و گەوهەری ئایین ، وەلێ هێرشی کردۆتە سەر ریابازان و فیقهبازان و کەچرەوان لە گەوهەری بنەماکانی ئایین . سەرباری ئەوەش هیچ دیرۆکڤانێك یا نووسەرێك لەوانەی باسی خەییامیان کردووە ئاماژەیەکیان بۆ بادەنۆشیی خەییام ، بگرە بۆ بادەنۆشیی زۆرینەی مامۆستاو هاوڕێ و شاگردەکانی نەکردووە.

لەم بارەشەوە دکتۆرە **تەغرید زەعیمیان** دەرەنجامی لێکۆڵینەوەیەکی قووڵ ئێژێ :

**" خەییام زەندیق نەبووە ، بەڵکو دینداریکی مکووم بووە ، تەنانەت (قفتی) کە هەڵوێستی ناڕەوایانەی سەبارەت بە خەییام پیشانداوە ، نەیگوتووە خەییام زەندیقە یا مەجووسییە ، وەلیٚ رەخنەی ئەوەی لیٚگرتووە کە بایەخی داوەتە زانستی یۆنانی و فەلسەفەکەی لە بواری ئیلاهییاتدا"**

بەهەرحاڵ...لەهەموو حاڵەتێکا دەبیٚ حیسابی ئەوە بکەین کە شیعر، (ئیلیەت) گوتەنی ئەرکێکی تایبەتی هەیە و " ئەرکەکەی فیکری نیە ، بەڵکو سۆزداریە" واتە " شیعر ئەڵتەرناتیڤی فەلسەفە ، یا لاهووت ، یان ئایین نیە " تا بە فەتوایان لیٚ بێینە دەست و بەگژیا بچین . مەبەستم ئەوەیە کە شیعر لە بنجوبنەواندا مەیدانێك نیە بۆ ئەوەی فەتوا دەربارەی بدریٚ...خۆ ئەگەر شێخ مونجد کەمترین ئاگاداریی لەمەڕ کتێبەکەی دکتۆر حەفنی هەبوایە ، ئەم فەتوایەی (کە لەسەر بناغەی نەزانییەکی زەق رۆنراوە) بەرەڵا نەدەکرد ! ئینشاڵڵا هەوادارن و هاوشێوەکانی شێخ مونجد کە کەڵکەڵەی خەییامیان لەسەرە ، ئەم کتێبە و کتێبەکەی دیکەم (کۆبەرهەمە زانستی و ئەدەبی و فەلسەفییەکانی خەییام ) کە بەدوایدا دێت دەخوێننەوەو، هەنگیٚ رادەی بیٚ ئینسافی و بیٚ ویژدانی ئەو جۆرە فەتوایانەی دەرهەق خەییام بۆ بەدیار دەرکەویٚ و، ئەو فەتوایە هەڵدەوەشێتەوە، دەنا ئەم فەتوایە و فەتوایانی لەم جۆرە گەورەترین زیان بەکرۆکی پرەنسیپەکانی ئیسلام دەگەیەنن و، رووە راستەقینە گەشەکەی دەشێوێنن ، ئەمەو جگە لەو نەهەقییەی کە دەرهەق بە زاناو فەیلەسووف و ئەدیبێکی ئیسلامی مەزنی وەکو خەییام دەکریٚ ، کە لە کۆنەوە تا ئێستا بوختانی بۆکراوەو بۆ دەکرێت ! ئەم دووبەیتە عەرەبییەش زمان حاڵیەتی :

" قيــلَ إنّ الإلــهَ ذو ولـــــدٍ
قيــلَ إنّ الــرســولَ قَدْ كهنا
مــانجى اللهُ والرّســـولُ معاً
مِنْ لسانِ الورى فكيفَ أنا؟!"

وتيان خوا كوڕی هەیە ،
وتیان پێغەمبەر جادووبازیکردووە
جا خواو پێغەمبەر پێکەوە
لــە زمانی خەڵك رزگاریان نەبووە
ئەدی منی بەندە چۆن رزگارمبێ لەم و لەوە؟!

# مشتومڕێكی بێ بڕانەوە

لەو زرەتوێژینەوەی لە پەراوێزەیلی پاچڤەی چـوارینەکان لـە (دیـوانی خـەییام بـە کـوردی) دا کردوومـە ، کـە بـەکۆی رای زۆربـەی خەییامناسـانی گـەورەو شـارەزا چوارینەی رەسەن و زرەڕەسەنن ، دەتوانین بە دڵنییاییەوە پەی بەو ئەو راسـتییە تاڵـە بەرین ، کە چ بوختانەیلێکی گەورە بەخەییامدا کراوە ، نەمازە گەلێك لەو چـوارینە رەسەنانەشی - کە لە کۆنترین ژێدەرو چاڤکانیانی باوەڕپێکراوی نزیکـی سـەردەمی خۆیشیەوە - بە شێوەی جیاواز گێڕدراونەتەوەو، دەسکاری کراون ، بگرە دراونەتـەپاڵ ئەم شاعیرە یان ئەو شاعیرە ، تەنانەت هەندێکیان دراونەتەپاڵ دوو شاعیر ، بگرە سێ و چواریش ! جا دەبێ حاڵی چوارینەکانی تر چۆن بێت ، کە لـە سەرچـاوەو شـوێنانی دواتردا دۆزراونەتەوەو، بە چـاك و خراپـەوە لـە جەنگـەڵێکی چـڕی پـتر لـە هـەزار چوارینەی ئاوەکی (دزراو قەڵپ و تێخزاو) تێکەڵبووە ؟!

جا لە سۆنگەی هەموو ئەم چوارینانەوە لەبەردەم مەتەڵێکی ئاڵۆزدا، کە خەییامـە گرفتاری داماویی دەبین ، بەڵام باسکاران و توێـژەران و رەخنـەگران کۆڵیـان نـەداوەو دەستەوئەژنۆ دانەنیشتوون و، لە گەڕان و توێژینەوەو لێکدانـەوەو پـەیجۆری خۆیانـدا هەمیشە بەردەوامبوونە .

دکتۆر محەممەد جەعفەر یاحەققی (ل : ١٩٤٧) دەڵێ : " تەمومژو ئاڵۆزیی لە ژیـان و شیعری گەلێك لە شاعیران و هزرڤانان نیشتووە ، بەڵام چـونکە خـەییام پـتر مینـاك

زانای بیرکاری و بوارانی دیکە ناسراوە و، لەوەشە بەخۆی نەیویستبێت وەکو شاعیر بناسرێت ، ئەو تەمومژەی کە لە ژیان و شیعرەکانیدا نیشتووە چڕترە . خەییام شیعری بۆخۆی دەگوت و لە تەمەنیا هاتووچۆی کۆڕو کۆبوونەوەی شاعیرانی نەدەکرد، بۆیە شیعرەکانی دوای مردنی بە دەیان ساڵ بڵاوبوونەتەوە "

هەڵبەتە ئەم لێکدانەوەیە بەتەنیا بەس نیە ، دەبێ ئەوەش بڵێین کە ناوەڕۆکی فەلسەفییانەی چوارینەکانی خەییام و توندڕەوی فەقیهان بواریان نەداوە تا خەییام لە زەمانی خۆیدا وەکو شاعیر ناودەربکات ، بۆیەش بەس لەلای هاوڕێ هەرە نزیکەکانی بە شاعیر ناسراوە و چوارینەکانی لەپاش مردنیدا بەرە بەرە بڵاوبوونەتەوە. ئاڵۆزییەکی تریش هەیە ، کە پەیوەستە بەخودی چوارینەکانەوە و، باسکاری ناقدار بەهائەددین خورڕەمشاهی (ل : ١٩٤٥) لەم بارەیەوە دەڵێ : " دەقێن هونەری باڵا دوو لایەن و پتر لە مانایەکی حەرفییان هەس ، ئەمەش میناك رێسایەکی گەورەیە ، جا لەم مانایانە هەندێکیان حەرفین و، بەراڤەو شرۆڤە دەردەکەون ، هەندێکی تریان زۆر قوولن پێویستییان بە تەئویلە تا واتای راستەقینەیان دەربکەوێ و، دیارە چوارینەکانی خەییام لەم رێسایە بەدەر نین "

سا بۆیە لە کۆنەوە تا نها مشتومڕێکی زۆرو دوورودرێژ لەسەر ژیان و بەرهەمەکانی خەییام کراوەو دەکرێ ، بەتایبەتی لەسەر ناوەڕۆکی چوارینەکانی ، هەڤدژ بێژییەکی زۆر لە دیاریکردنی ژمارەیان ، بگرە لەسەر جۆری داڕشتنی رەسەنترین و ئەسڵترینیان کراوە ، وەکو لە پەراوێزو دەهمەنی وەرگێڕانەکەی بەندەدا دەردەکەوێ ، هەڵبەتە بە پشتەوانەی ئەنجامگیرییەکانی چەندین پسپۆر و شارەزای ئێرانی، چونکە " خەڵکی مەککە بە دۆڵ و شیوەکانی شارەزاترن" لەوانەش : میرزا محەممەد خان قەزوینی (١٨٧٣- ١٩٤٩)، محەممەد عەلی فرووغی (؟ ١٨٧٧- ؟ ١٩٤٣)، ئیسماعیل یەکانی

(١٨٨٧- ١٩٧٤)، قاسم غەنی (١٨٩٣- ١٩٥٢)، سەعید نەفیسی (١٨٩٥- ١٩٧٥)، عەلی دەشتی (١٨٩٥- ١٩٨١)، رەشید یاسمی (١٨٩٦- ١٩٥١)، عەبباس ئیقبال ئاشتیانی (١٨٩٦- ١٩٥٥)، جەلالەددین هومایی (١٨٩٩- ١٩٨٠)، حوسێن شەجەرە (١٩٠٠- ١٩٨٢)، بەدیعولزەمان فروزانفەڕ (١٩٠١- ١٩٧٠)، تەقی ئەرانی (١٩٠٢-١٩٣٩)، صادقی هیدایەت (١٩٠٣- ١٩٥١)، موجتەبای مینەوی (١٩٠٣- ١٩٧٦)، غولامحوسێن موصاحب (١٩١٠- ١٩٧٩)، فەزڵو لّلا رەزا (**ل** : ١٩١٥)، **محەممەد** مەهدی فولادوەند (١٩٢٠- ٢٠٠٨)، **محەممەد** تەقی جەعفەری(١٩٢٥- ١٩٩٨)، **محەممەد** ئیسلامی نودوشەن (**ل** : ١٩٢٥)، غولامحوسێن ئیبراهیم دینانی (ل : ١٩٣٤)، موحسن فەرزانە ، رەحیم رەزازادە مەلیك (١٩٤٠- ٢٠١٠)، **محەممەد** رەزا قەنبەری (**ل** : ١٩٥٥)، ئەصغەر بەرزی (**ل** : ١٩٥٩)، سەیید عەلی میر ئەفزەڵی (**ل** : ١٩٦٩) و چەندین باسکاری تر، کە لە پەراوێزێن (دیوانی خەییام بە کوردی) و لە دووتوێی ئەم کتێبەدا ناویان هاتووە ، لە بەرهەمێن خەییام کۆڵینەتەوە و، زۆربەیان گەییونەتە قەناعەتی تەواو و دڵنیایی بنجبڕ، کە دیوانە راستەقینەکەی خەییام لە دەورووبەری (١٨٠ چوارینە و پارچە شیعری فارسی و عەرەبی) یە و، ئەو پەڕی دەتوانرێ دەوروبەری (١٠٠چوارینە) یەکی تر وەکو (ئەگەر) نەك (یەقین) بخرێتە سەریان ، بەسەرناڤی (چوارینانێکی زڕەخەییامی = خەییامی ئاسا)، کەچی پتر لە هەزار چوارینەی ئاوەکی دراوەتەپاڵ خەییام و، ژمارەی چوارینەکانی گەییوەتە نزیکەی (١٣٠٠ چوارینە !) سەعید نەفیسی گەورە پەیجۆر (١٢٢٤ چوارینە) ی لە (١٦٢ کتێب و کەشکۆڵ) دا دۆزیوەتەوە ، کە دراونەتەپاڵ خەییام ، بگرە توێژەر **محەممەد** جەعفەر **یاحەققی** لەم دوادواییە رایگەیاند کە ئەو چوارینانەی دراونەتەپاڵ خەییام ( **پتر لە دە هەزارە)** ! و، ئێژێ : " بەڵام ناتوانین بە شێوەیەکی بنجبڕانە (دەیەکی) ئەو ژمارەیە بەهی خەییام بزانین " بگرە " کەسێك

نیه بوێرێت به موقەددەساتی خۆی سوێندبخوات و، بەدڵنیاییەوە بڵێ ئەم چوارینەیە یان ئەوچوارینەیە هی خەییامە ! " ئاربری (١٩٠٥- ١٩٦٩) هەمان رایی هەس کە بەشێوە و گوزارشتێکی تر دووپاتیدەکاتەوە ، کە زۆر ئەستەمە بەدڵنیاییی تەواوەوە هیچ چوارینەیەك بدرێتەپاڵ خەییام ، گەرچی پێی وایە خەییام (٧٥٠ چوارینە) ی بەلای کەمەوە بەجێهێشتووە . رۆژهەلاّتناس نیکلسون (١٨٦٨- ١٩٤٥) چوونگەیەکی بەم ناوەڕۆکەوە دەربڕیوە : **" ئەگەر خەییام زیندوو ببێتەوە ، دۆشدادەمێنێ و ناتوانێ چوارینە رەسەنەکانی خۆی لەناو خەرمانی ئەو هەموو چوارینە ئاوەکیانەدا جیابکاتەوە !"** کەواتە زۆر چوارینەی هەڵبەستراو هەن (چ ئاوەکی چ دزەکردوو) و ژمارەیان لە هەزار زیاترە ، چ بە پاکنیازی و، چ بە بەدنیازی لەلایەن گەلێك شاعیران و خۆبەشاعیرزانان و شاعیرۆکانی هەمەجۆر مەشرەب بۆ مەبەستێن جیاواز هۆنراونەتەوەو دراونەتەپاڵ خەییام " لەوانەیە ئەهلی فەلسەفە ، یا نەزانان یا گومانداران ، یان زەندیقان بووبن و، لەگینە هەندێکیان ئەهلی رابواردن و بادەنۆشی بووبن ، ویستبیان بە مەی و هەوەسبازییدا هەڵبدەن ، یاخود سۆفییانێك بووبن چوارینانی (بادەنۆشی) یان بەدڵدا چووبێ و لاساییان کردبێتەوە ، یان خەڵکانێکی زاهید بووبن و لەسەر رێبازی خەییام چوارینەیان بۆ بێزراندنی دنیا دانابێت . جا هەموو ئەمانە لەگەڵ چوارینەکانی خەییامدا بەجۆرێك تێکەڵبوونە ، کە نازانین کامەیان هی خەییامەو کامەیان هی ئەو نیە ! ئیدی هەر چوارینەیەکی ئاوارەو بێ خاوەن هەبووبێت ، یان خاوەنەکەی گومناو بووبێ ، دراوەتەپاڵ خەییام . ئەمەش تاوانی ئەو خۆشنووس و نووسخەنووسانەیە ، کە هەر چوارینەیەکیان دەست کەوتووە داویانەتەپاڵ خەییام و دەسکاریانیش کردووە..." بەپێی دیاریکردنی باسکاری گرانقەدر عەبدولمونعم حەفنی .

هەڵبەتە زۆربەی چوارینە هەڵبەستراوەکان بازاڕی و بێ نموودن ، بەتایبەتی ئەوانــەی کە کوفرئامێزو بادەنۆشی و ئیباحییەتخوازن .

ئەمە و جگــە لــەوەی کــە لەلایــەن کۆکــەرەوە و نووســەرەوانێکەوە تۆمــارکراون و دراونەتەپاڵ خەییام ، کە زۆربەیان فریان بــە دنیــای شــیعرو تێگەییشــتنی شــیعرەوە نەبووە ، یان خەڵکانێکی بەدنیاز و دڵڕەش بوونە...ئیدی کار گەییووەتە ئــەوەی کــە جیاکردنەوەی چوارینە ئەسڵی و رەسەنەکان لە ئاوەکی و ناڕەسەنەکان نیمچە مــەحاڵ بێت . هەر بۆ دووپاتکردنەوەی ئەو بۆچوونەی سەرێ ، پێم وایە دیــاردەی شــیعردانان بەناوی خەییامەوە وەکو پەرچەکردارێکی راستەوخۆ و ناڕاســتەوخۆیە لــە ســەردەمی شایەکانی سەفەوییاندا، کە بە فەرمی شــیعەگەراییان بەســەر هــەموو ئێرانییەکانــدا سەپاندو، لە کوشتنی تائیفی نەدەپرینگانەوە، بە پشتیوانی فەتوای فەقیهانی شیعە ، کە لە چیای عاملی لوبنان و لە بەحرێنەوە هــاتبوون بــەخۆیان و زارۆچــەکانیانەوە و، ئەستێرەیان بەرزببوەو بووبوونە هاوتای ئیکلیرۆسی ئەرستوکراتی ئێرانی دەســتڕۆ لــە هەردوك دەسەڵاتی ئایینی و دنیاییدا...جا لەگەڵ زیادبوون و بــەهێزبوونی دەســەڵاتی فەقیهان و فیقهبازان ، کە جەختیان لەسەر زانستە نەقڵییەکان دەکردو بەسەر زانستە ئەقڵییەکاندا پەسەندیان دەدا، بۆیەش تڕۆکردن و هەندێ جار سەرکوتکارییەکی توندی ئەدیبان و فەیلەسووفان و سۆفییانیش هاتە ئاراوەو بووە هۆی مشــەختبوونی ســەدان ئاوەزمەندی گەورەی ئێرانی و کۆچــکردنیان بــەرەو هندســتان و شــوێنانی تــر. بۆیــە یەکێك لە پارادۆکسەکانی مێژووی ئێرانی ئەوەیە، کە کەڵتوور (بە زمانی فارســی) و هونەرە ئێرانییەکان، لە (سەردەمی تەیمووری)دا لە هندستان گەشەیکرد، کەچــی لــە ئێراندا بە درێژایی چەند سەدەیەك دایەکەندی و وشك هەڵات و کەســاد بــوو، تــا لــە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەیەمدا جارێکی تر بووژایەوە و ژیایەوە!

**عەبدولواحید گەیلانی (؟!)** کە یەکێك بووە لە شایەدحاڵەکانی ئەو سەردەمە ، لــە وەسفی ئەو وشکە فەقیهانە و فیقهبازە ماستاوچییانەی دەسەڵاتداران گوتوویەتی :
" زۆربەیان دزو درۆزنن و هەموو ئامــانج و مەبەســتێکیان شــۆرەت و بەرژەوەنــدی ماددییــە" و ئاشکراشــە کــۆڵێن تێرنــەر (**ل** : ١٩٥٥) گوتــەنی : "مشــتومڕە تونــدو قووڵەکانیان لەسەر شتە رواڵەتییەکانی فیقه بووە ، زیاتر بــۆ پۆشــینی بایەخنــەدانی خۆیان بە پەیامی راستەقینەی ئیسلام بــووە " جـا هــەر ئەمــەش هــۆی زیــادبوونی ژمارەی ئەو چوارینە تێخزاوانەیە ( نەمازە کوفرئامێزو بادەنۆشیی و ئیباحییەتخوازییە تورەهاتەکان) ی ئەو سەردەمە بوو، کە هەڵبەستراون دژی ئەو رەوشە و بە بوختــان و ناهەق دراونەتەپاڵ خەییام !

هەڵبەتــە دەبــێ هۆیــەکی دیکــەی گرنگــی زاوزوێــی چــوارینەکانی خــەییام فەرامۆشنەکەین ، کە دەیان چــوارینەی شــاعیرانی بانــدۆرباری خــەییام دراونەتــەپاڵ خەییام ، بەسۆنگەی ناوەڕۆکە خەییامییەکانیانەوە و، باســکاران توانوویانــە زۆربــەی ئەو چوارینانە دەسنیشانبکەن و بۆ خاوەنەکانیان بیانگەڕێننــەوە ، ئــەگینا ســیرووس شمیسا گوتەنی : " مەبەست چییە شیعری شاعیرێکی ناسراوی وەك خەییام بدرێتەپاڵ شاعیرێکی گومناوی وەك نــەجیب جرفازقــانی ؟ کــە لــەڕووی مەنتیقــەوە دەبــێ بــە پێچەوانە بێت ، واتە چونکە ئەم چــوارینەی نەجیبــە نــاوەڕۆکی خەییامییــە ، بۆیــە دراوەتــەپاڵ خــەییامی بــەناوبانگ ، ئەمــەش هــەموو چــوارینەکانی ئــەو شــاعیرە گومناوانە کە دراونەتەپاڵ خەییام دەگرێتەوە " بۆ نموونە ئەم چوارینەیەی شاهـ سنجان خــەوافی (م : ؟ دەوروبــەری ١١٩٦ — ١٢٠٢ ز) و دەدرێتــەپاڵ مــەولانا جەلالــەددین و قوتبەددین حەیدەر — ش (١١٣٦- ١٢٢١) :

" رنـدی دیـدم نـشسته بـر خنگ زمین
نه کفـر نه اســلام و نه دنیـا نه دین
نه حق نه حقیـقت نه طریقت نه یقـین
اندر دو جهـان که را بود زهـرهء این ؟"

**به پاچڤەی شێخ سەلام**(١٨٩٢-١٩٥٩):

" ڕەنـدێـکم بینی لە ڕووی سـەرزەمین
بێـزار لە دنیـا ، بـێـزارتـر لـە دیـن
حەق ، حەقیقەت ، شەریعەت ، یەقین
لەلای وەك پووش بوو! ئێوەش وا بژین"

کێشەیەکی ئاڵۆزی دیکەش ئەوەیە ، کە چەندین چوارینەی دراوەپاڵی خەییام لەم ژێدەرو ئەو ژێدەرەدا، لە ژێدەرانی دیکەدا دراونەتەپاڵ پتر لـە شـاعیرێکی دی ! وەك ئەم چوارینەیە ، کە دەدرێتەپاڵ : پندار رازی ، ئەبوو سـەعید ئەبووخـەیر، سـەعدی شیرازی ، فەخرەددین عیراقی ، روزبەهانی بەقلی شیرازی و شێخ روباعی مەشهەدی :

"هـنـگام سـپیدەدم خـروس سـحری
دانی که چرا همی کـنـد نوحەگــری
یعنی کـه نمـودنـد در آیـینەء صـبح
کز عمر شبی کۆشت و تـــو بی خبری"

**به پاچڤەی عەونی** (١٩١٤- ١٩٩٢) :

"ئـەم کەڵەشـێرەی دەمی بەربەیان

دەخوێـنێ ، دەڵێ : هــەژاری نەزان
خـۆش رابـوێـــرە نـاگـەڕێـتەوە
شەوێکی دیکەش رۆیشت لە ژیان "

هەروەها کێشەیەکی ئاڵۆزی تریشمان هەس ، کە دووبارەبوونەوەو سێ بارەبوونەوەی گێڕانــەوەی چـەندین چـوارینەیە بەداڕشـتنێکی کـەم یـا زۆر جیـاواز و، یـا پـاش و پێشکەوتنی نیوەدێڕەکانیان مینا ئەم چوارینەیە :

"دریاب که از روح جدا خواهی شد
در پـردهء اسـرار فنـا خـواهی شد
می خـور که نـدانی ز کجا آمدهء
خوشباش ندانی بکجا خواهی شد"
" ای آمـده از عـالم روحـــانـی تـــفــت
حیران شده در پنج و چهار و شش و هفت
می خـور چـو ندانـی از کـجـا آمـــدهء
خوش باش ندانی بکجـا خـواهی رفـت"
"دریاب که از روح جـدا خواهی رفت
در پـردهء اسـرار فنـا خـواهی رفـت
می نـوش نـدانـی از کجـا آمـــدهء
خوش باش ندانی بکجا خواهی رفت"

**واته :**

وشیاربە گیانت لێت دەتـرازێ ودەچی
لەپشت پەردەی رازی فەنا پێوار دەبی
مەی بنۆشە کە نازانی لە کوێوە هاتی
بەکەیـف بژی کە نازانی بۆ کوێ دەچی

ئەمما دیاردەی جیاوازیی ئەم وشەو ئەو وشە لە گێڕانەوەی دەیان چوارینەدا ئەوەندە زۆرە هەر مەپرسە ! خوێنەری هێژا - کەسێ نەمرێ - لە دەهمەن وپەراوێزی چوارینە پاچڤەکراوەکانی **(دیوانی خەییام بە کوردی)** دەیبینێت .

وێڕای هەموو ئەو کێشـە و گرفتانـەی سـەرەوە ، زۆر توێـژەرو باسـکاری جـوامێر شانیانداوەتە بەر ئەم ئەرکە قورسـەو توانییانـە بـەزەبری پشـکنین و لێکۆڵینـەوە و باسەکانیان بە درێژایی پتر لە سـەدەیەك ، بگەنـە چارەسـەرییەکی تـەقریبی ، نـەك بنجبڕیی ئەم گیروگرفتە سەخت ودژوارە .

سەرباری هۆدۆزیی سەرەوە ، ئەم گرفتە تا ئێسـتاش بەردەوامـە ، بگـرە پێویسـتە ئەوەش فەرامۆشنەکرێ ، کە هەر هەموو دەسنووسانی چوارینە رەسەن و ئەسـڵەکانی خەییام و زۆربەی سەرچاوە دەسنووسەکان ( تەزکەرە و گەمیە و بـەیاز و کەشـکۆڵێن شیعری) فەوتان و نەمان ، کاتێك کە ئێران و، نیشابوور بەتایبەتی کەوتەبەر هێرشی دڕندەی وێرانکردن و سووتاندنی مەغۆل و تەتەرانەوە...ئیـدی چـوارینەکانی خـەییام کەوتنە سەر زاران و دەماودەمیان پێکرا و گۆڕان و دەستکارییان تێـدا کـرا. پاشـان نوسخەنووسان بەسەر چوارینەکانی خەییامدا دابارین و، زۆر ئەدگاری تایبەتمەنـدییان

گۆڕی و شیعری خەڵکانی تریان بەگەڵ خستن و، قسەی وایان دایەپاڵ و بە سەرا ساغکردەوە کە هەرگیز بە دەمیا نەهاتووە، بەپێی ئاماژەی ئەحمەد رامی شاعیر و پاچڤەوان .

جا بەو جۆرە گەلێك لە چوارینەکانی خەییام ونبوون و ئەوەش کە مایەوە لە نیازپیسی و چاوچنۆکی نووسەرەوەو نوسخەگران دەرباز نەبوو، میناك پێشتر ئاماژەمان بۆ کردووە ، هەندێکیان بەکەیفی دڵی خۆیان زۆریان لێ زیادکردووە و، زۆریشیان لەو شتانەی کە بەدڵیان نەبووەو، لەگەڵ بیرو باوەڕیان نەگونجاوە لێ لابردبووە ، جگە لە زیادکردنی لاپەڕەکانی نوسخەکان ، بۆ ئەوەی خەڵات و پارەی پتری لە پاشاو میرو سوڵتانان پێ بکێشنەوە ، چونکە لە سەردەمانی دێرین نوسخەی کتێبان بە کێشی تەرازوو بەرانبەر زێڕ ئاڵووگۆڕ دەکران ! سەرباری ئەوەش شاعیرو شیعربازو شاعیرۆکانی نامەردو ترسنۆك زۆربەیان لەوە نەدەپرنگانەوە چوارینە کوفرئامیزو ئیباحییەئخوازەکانی خۆیان - کە لە ئاکامەکانی دەترسان - بدەنەپاڵ خەییام ، وەك هەندێ لەگام و پۆرخزو نەگریسان ، کە بە دەمی خەییام قسەی ئەوتۆیان هەڵبەستووە ، کە سیما هزرییە راستەقینەکەی خەییام دەشێوێنێ . لێرەشدا هەڵوەستەیەك لەسەر تەعلیقێکی زیرەکانەی **صادقی هیدایەت** دەکەین ، کە دەڵێ : **" ئەگەر کەسێك سەد ساڵ بژی و، رۆژانە دووجار راوبۆچوون و باوەڕەکانی خۆی بگۆڕێ ، هێشتا ناتوانێ گوزارشت لەو هەموو بیرو بۆچوونە ناکۆکانە بکا ! "** بۆیەش هیچ سەیر نیە باسکارێکی ئێرانی وەك محەممەد عەلی نودوشەن بەڕاشکاوی بڵێ : **" بە دڵنیاییەوە پێم وایە ژمارەی چوارینە ئەسڵی و رەسەنەکانی خەییام لە شازدە چوارینە تێناپەڕن" !** بەڵام سەیروسەمەرە لە رای هەندێ باسکارانی ئێرانی و فەرەنگیدایە ، کە هەر بە جارێك نکۆڵی لە شاعیربوونی خەییامی زانا دەکەن ! لەوانە موحیت

تەباتەبائی (١٩٠٢- ١٩٩١) لە کتێبەکەی (خەییامی یان خەییام) و **محەمەد** رەزا جەلال نائینی (١٩١٦- ٢٠١٠) و رۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی هانس شیدەر (١٨٩٦-١٩٥٧) کە لە کۆنگرەی رۆژهەڵاتناسی لە (بۆن) لە ساڵی ١٩٣٤ دا بە هەموو قەناعەت و یەقینەوە رایگەیاند : **" فەیلەسووف و ماتماتیکزان عومەری خەییام هیچ شیعرێکی دانەناوەو ئەم چوارینانەی دراونەتە پاڵی ، وێنەیەکە لەو شیعرە گونووسییەی کە لە سەردەمی دەسەڵاتی (مەغۆلان) دا رەواجدار بووە ، هەروەها لە سەردەمی حوکمی سەلجوقییەکاندا کە گەندەڵی تەشەنەی کردبوو، بۆیە کاتی ئەوە هاتووە ناوی خەییام لە مێژووی ئەدەبیاتی ئێرانیدا بسڕدرێتەوە" !**

بەڵام لێرەدا هاودەنگ لەگەڵ صادقی هیدایەتا دەپرسین : باشە ئەگەر ئەم چوارینانە (مەبەستم چوارینە ئەسڵی و رەسەنەکان ، کە ژمارەیان تا ئێستا گەییوەتە پتر لە هەفتا چوارینەیەك) لە خەییامی بسێنینەوە ، بیاندەینە پاڵ کێ ؟! هەڵبەتە بەپێی پرسیاری صادق هیدایەت : **" دەبێ خەییامێکی دیکەی هاومێژی هەبێ ، کە لەگینە لە رووی پایەی زانستییەوە لەو باڵاتربێ ! دەبێ کێ بێ ؟ بۆچی کەس نایناسێ ؟ !"** بەندەش حەزدەکەم هەر لەم بارەیەوە منجڕانە بپرسم : **ئەگەر خەییامی زاناو فەیلەسووف شاعیر نەبوایە ، بگرە شاعیرێکی گەورە و بەراستی نزیکەی (سەدو پەنجا چوارینە) یەکی لەپاش بەجێ نەمابایە ، ئایا ئەم هەموو کاریگەرییە گەورەیەی بەسەر چەندین شاعیرو کەڵە شاعیری دواتردا دەبوو ، کە هەندێکیان بەناو ناوی دێنن ، جگە لەوەی کە لە دەیان سەرچاوەی کۆنی ئیحتوباردار وەکو شاعیر لەگەڵ نموونەی چوارینەو پارچە شیعرەکانیا ناوبراوە؟ !**

*

کێشەو گرفتی ئاوێتـەبوونی چـوارینە ئەسـڵی و ئاوەکییـەکان گـەلێك لـە گـەورە خەییامناسانی چ لە ئێران و چ لە جیهـان نیگـەرانکردووە **" زۆر ئەسـتەمە بتـوانین چوارینە رەسەنەکان لە ئاوەکییەکیان هەڵاوێرین ، بەتایبەتی کە ژمارەی ئاوەکییەکان پتر لە هەزار چوارینەیەو، چوارینەش لە شێوازو داڕشتن و عەروزدا وەکـو یـەکن . ئەوەی قورسی ئەم کارە زیاتردەکا ئەوەیە کە هەر چـوارینەیەك سـەربەخۆیی خـۆی هەیـە..هیچ ریزبەندییـەکی هزرانـە یـان زنجـیرە وێنـەگرتنێك کۆیـان ناکاتـەوە، واتاکانیانیش زۆر دووبارە دەبنەوە و، جیاوازی نێوان زمانی فارسی سەردەمی خەییام و پاش مردنی خەییام زۆر کەمە و، زانیارییەکی زۆرمان دەربارەی ژیانی خەییام نیە و، بەرهەمی ئەدەبی دیکەیمان نەدۆزیوەتـەوە ، تـا لـە رێگەیـەوە لـە کەسـایەتی ئەدەبیانەی خەییام تێبگەین ، یان بۆ روونکردنەوە ئاڵۆزی چوارینەکانی پـەنای بـۆ بەرین"** بە پێی دووپاتکردنەوەی شاعیرو پاچڤەوان ئەحمەد رامی .

بەڵام وێڕای ئەوەش ئەو خەییامناسانە دانەسەکنیون و، هەوڵیانداوە بـە پشـکنین و وتوێژینەوە تێروتەسەلەکانیان ئەو جۆخینە چوارینە زۆرەی دراونەتـەپاڵی خـەییام لـە بێژەنگ بدەن ، تـا چـوارینە خەییامییـە رەسـەن و راسـتەقینەکان هـەڵاوێرن ، کـە دیارترینیان ئەمانەن : خەییامناسی رووسـی ڤالـەنتین ژۆکۆڤسـکی ، خەییامناسـی دانیمارکی ئارتەر کریستنسن ، خەییامناسی ئەڵمانی فردریك رۆزن ، خەییاماسانی تورك حوسێن دانش (١٨٦٩- ١٩٤٣) و عەبدولباقی گولپینـارلی و، چـەندین پـەیجۆری ئێرانی ، کە رەنگە بەرجەستەترین پێشەنگیان لەم مەیدانەدا ئەدیبی پایەبەرز صادقی هیدایەت بێت ، کە لێکۆڵینەوەیەکی تێروتەسەلی دەربارەی شیعرو فەلسەفەی خەییام و ساغکردنەوەی چوارینەکانی ئەنجامداوە و(١٤٣ چوارینە) ی هەڵبژاردووە و لە سـاڵی

١٩٢٤ دا له كتێبێكدا بـڵاوی كردۆتـەوه ، گەرچـی گلـەیی ئەوەشـی لێـدەكرێ ، كـە خەییامی میناك نهلیستی و خوانەناس و ئەبیكۆری پیشـانداوه . لـەدوای هیدایـەت جووته پەیجۆری مەلەوانی ئەم دەریایه فرووغی و غەنی توانیویانه (١٧٨ چوارینه) ساغ و جیابكەنەوه ، كه(٦٦) یان رەسەن و كۆدن دوای ئەوانیش كەسانی دی هـاتوون (كـه ناوی گرنگترینیان لێرەو لەوێی ئـەم كتێبـەدا دێـت....) لەوانـە : **محەمـەد** مەهـدی فولادوەند كه (١٥٥چوارینه) ی خەییامی به رەسەن هەڵبژاردووه و (٩٥ چوارینه) ی به گومانبار و زڕەخەییامی زانیوه و، عەلی دەشتی كه (٧٤چوارینه) ی رەسەنی سـاغ و جیاكردۆتەوه، كه (٣٦) یان ئەسڵی كۆدن ، **محەمەد** قەزوێنی،بەدیعو لزەمان فروزانفەڕ، عەبباس ئیقبال ئاشتیانی ، جەلالەددین هومایی، **محەمەد** عەلی ئیسلامی نودوشەن ، موحسن فەرزانه و، ئەحمەد شاملوو، كه (١٢٥ چـوارینه) ی خـەییامی بـە رەسـەن و ئەسڵی هەڵبژاردووه و بەدەنگی خۆی بەشێوەیەكی هونەریانه لەسەر كاسێت تۆمـاری كردوون. ئەوجا رەحیم رەزازادەی مـەلیك- كـە لـە كتێبـە عەرەبییەكـەما (دیـوانی عومەر خەییام) دا بەشـێوەیەكی سـەرەكی پشـتم بـە توێژنەوەكـەی بەسـتووه- (٥٧ چوارینه) ی رەسەنی خەییامی ساغكردۆتەوه .

هەڵبەته لەم تەنگه بەرەدا، ئەستەمه بەدرێـژی و تێـرو تەسـەلی هـەموو گـەڕان و پشكنین و رێبازو شـێوازی تۆژینـەوه و ئەنجامگیرییـەكانیان سـەبارەت بـە چـوارینه دزەكردوو، ئاوەكی و رەسەنەكانی خـەییام بخەینـەڕوو، بـەڵكو وام بـەباش زانـی كـە كورتەیەكی چڕكراوه له (خەییام له روانگەی رۆژئاواییەكانەوه) ی توێـژەرو باسـكاری گەوره عەلی دەشتی ، كه بەشێكه له كتێبه بەهادارەكەی (دمـی بـا خیـام= تاوێـك لەگەڵ خەییام) دا پێشكەش بكەم ، هەڵبەته به پشتیوانی دەقه فارسییەكەی و پاچڤه

عەرەبییەکەی لە لایەن خەییامناس دکتۆر یووسف حوسێن بەککار (ل : ١٩٤٢) کە وریگێڕاوەتە عەرەبی و پەراوێزێکی فرەی بۆ داناوە .

ئینجا بەپێی پێویست هەر بە لێکۆڵینەوەکەی عەلی دەشتی پشتم نەبەستووە ، بگرە پەنام بۆ هەر زانیارییەکی گرینگ لێرەو لەوێ لەمبارەیەوە بردووە ، تا لەگەڵ ئەنجامگیرییەکانی ئێرەم و ئەو پەراوێزانەی کە بۆ وەرگێڕانی چوارینەو پارچە شیعرییە رەسەنەکانی خەییامم نووسیون ، موتوربەیان بکەم .

لێرەشدا دەبێ ئاماژە بۆ درێغییەکی زەقی خۆم بکەم ، کە زۆربەی گوتەکانی کەڵە زانا (عەلی دەشتی) م نەخستۆتە نێوان جووتە کەوانی خواستنەوە "........" و، هەندێکی تریانم خستوونەتە نێوان جووتە کەوانی خوازیارییەوە بێ ئەوەی ناوی بێنم ، بیانووشم ئەمەیە کە هەندێك لە گوتەکانم کورتکردوونەتەوەو هەندێکی تریانم بە شێوازی خۆم دارِشتوونەتەوە و، ئەو زانیاریانەشم کە لێرەو لەوێ دەسکەوتوون، تێهەڵکیش کردوون و، نموونەو بەڵگە شیعریەکانیشم سەر لەنوێ وەرگێڕاونەتەوە و دەقە فارسییەکانیشم داناوە . لەوەیە ئەوە شەفاعەتم بۆ بکات ، کە ئیعتراف دەکەم زۆربەی زانیارییەکانم لەمەڕ باسەکانی : فیتزجیراڵد، ژۆکۆڤسکی ، کریستنسن ، دکتۆر رۆزن و پییێر پاسکاڵ...لە لێکۆڵینەوەکەی دەشتی و هەندێ پەراوێزو ئاماژەیێن بەهاداری باسکاری هێژا دکتۆر یووسف بەککار و، توێژەرانی دیکە وەرگرتوون .

## فیتزجیراڵدو بەیتەکەی

گەلێك لە رەخنەگران ئیدوارد فیتزجیراڵد (١٨٠٩- ١٨٨٣) نەك هەر بە خودانی فەزڵی گەورە لە ژیاندنەوەی خەییام (شاعیری فەرامۆشکراو) دەزانن ، بگرە بە مەزەنترین شاعیری ئینگلیزی زەمانی خۆیی دەژمێرن ، هەڵبەتە نەك

لەبەر ئەوەی شیعری باشی نووسیوە، بەڵکو لەبەرئەوەی چوارینە کانی خەییامی بە زمانێکی شیعری بەرزی ئەوتۆ پاچڤەکردووە کـە هاوتـای زمـانی شـیعریی شاعیرانی کلاسیکی سەردەم و پـێش سـەردەمی ڤیکتۆرییـە، گەرچـی یەکـەم پاچڤەوان نەبووە کە ئەو چوارینانەی وەرگێڕابێتە ئینگلیزی. هەڵبەتـە فـەزڵی ئەو دەستکەوتە ئەدەبییە دەگەڕێتەوە بۆ ئیدوارد بایلەر کاوەل (١٨٢٦- ١٩٠٣)ی هاوڕیی فیتزجیراڵد- مامۆستای زمانی سانسکریتی لە زانکۆی کەمبریج - کە لە ساڵی (١٨٥٤) دا فیتزجیراڵدی فێری هـەردوك زمـانێن فارسـی و ئیسـپانی کردبوو. بۆ زانینیش فیتزجیراڵـد زمانـانی لاتـینی ، یۆنـانی و فەرەنسـی لـە قوتابخانەدا فێرببوو، بەخۆیشی فێری زمانێن ئیتالّی و ئەڵمانی ببووە ، بگـرە خوێنەرێکی یەگجار تامەزرۆو پڕ تاسە بووە .

مامۆستا کاوەل توانیبووی کۆنترین دەستنووسی چوارینەکانی خەییام لە کتێبخانەی بودلیان لە زانکۆی ئۆکسفۆردا بدۆزێتەوە و، گوتارێـك دەربـارەی ئـەو دەستنووسـەو ژیـانی خـەییام لـە سـاڵی ١٨٥٨ دا لـە گۆڤـاری (کیلکـەتا) بڵاوبکاتـەوە و، پاشـان دەستنووسەکەی بەنامەیەکەوە بۆ فیتزجیراڵد بنێرێت. ئینجا فیتزجیراڵد خوێندیەوە و یەکەم جار (٣٢ چوارینە) ی بۆ زمـانی لاتینـی پاچـڤەکرد. پاشـڕا (٧٥ چـوارینە) ی وەرگێڕایە زمانی ئینگلیزی و لە ساڵی ١٨٥٩ دا بڵاویکردەوە . ئیدی تا نزیکی کۆچـی دوایینی لە زیادکردنی ژمارەیان و بژاکردنیان بەردەوام بوو، تا لە ئەنجامـدا وەرگێڕانـە هەڵبەستڤانییەکەی لەسەر (١٠١ چوارینە) ی خەییامی و ناخەییامی گیرسایەوە .

فیتزجیراڵد هەندێك لە نامـەکانی بـە نـاوو ئیمـزای (فیتـز عومـەر) دەنووسـی . هەروەها نازناوی (خەییامی ئینگلیزی) بەدەستهێنا، کەچی تا لە ژیانـدا بـوو نـاوی خۆی لەسـەر هـیچ چـاپێکی چـوارینەکانی خـەییام دانـەناوە ! پێدەچـێ پەنـدی لـە

بازاڕکزیی کتێبەکەی (شەش شانۆنامەی کالدێرۆن) وەرگرتبێ ، بەس ئەم ناونیشانەی دانــابوو (چــوارینەکانی خــەییامی شــاعیرو گەردووونناســی فارســی بــە پاچــڤەی هەڵبەستڤانیی ئینگلیزیی) ئەم پاچڤەیە بە پێی قسەی پـەیجۆر یووسـف بـەککار تـا ساڵی ١٨٨٥، واتە تا پاش مردنی فیتزجیراڵد بە دوو ساڵ ، هیچ ڕەواجێکی نەبووە .

گــەلێك خەییامناســان بۆیــان دووپاتبۆتــەوە کــە فیتزجیراڵــد دەســتکاری چوارینەکانی خەییامی کردووە ، لێـی لابـردوون و گۆڕیـونی، تەنانـەت شـیعری خەڵکی ترو شیعری خۆیشی تێ ئاخنیون ، لەپێناو گێڕانـەوەو بەرجەسـتەکردنی ڕووداوەکانی ڕۆژێکی تەواوی ژیانی عومەری خەییام لە کازیوەوە تـا شـەوێ بـە هەموو هەستونەسـت و هـزرو دۆخێکـی خەییام...لێرەشـدا پوختـەی بۆچـوونی باسکارو پاچڤەوان مەسعوود فەرزادی کورد (١٩٠٦- ١٩٨١) دەربـارەی گرێچـن و تانوپۆی بەیتەکەی فیتزجیراڵد دەخەینەڕوو :

**هەتاو گزنگدەدا ، مەیخانە دەکرێتەوە ، خەییام بێـدارە و تێـدەهزرێ و، بـەدەم نۆشینەوە بەرەبەرە پتر ڕوودەچێتە دەریـای هـزرین و ڕامانـەوەو، نـەمانی ژیـان و بێتوانایی ئاوەزی ئادەمیزاد لە هـەڵهێنانی مەتـەڵی هەسـتی (بـوون) و کێشـە و گرفتانی دی رایدەگرێت...بۆیە تاوێ تووڕە دەبێ و تاوێ داخ و کەسەر دەخـوات و، دەمێکی دی یاخی دەبێت، لێ لە هەموو حاڵەتەکاندا هەست و نەست و هزرەکـانی دەدرکێنێت . کاتێکیش ئەوپەڕی مەستدەبێ ، لە کۆتایی بەیتەکەدا مانگ هەڵدێ ، لەگەڵ ڕاکشانی شەودا ، خەییام لە تریفەی مانگ ڕادەمێنێ و سەرلەنوێ لە دەریای کۆڤان و هزریندا نقومدەبێ و، دەپەیڤێ و ئامۆژگارییەکانی خۆی دەخاتـەڕوو، لـە کۆتایی بەیتەکەیدا، کە ڕۆژێکی نموونەیی گریمانەیی ژیـانی شـاعیری فەیلەسـووف دەنوێنێ .**

*

ئێراناسی ئینگلیزی (**ل. وێل ساتون**) پێی وایە فیتزجیراڵد هەرگیز بەنیاز نەبووە پاچڤەیەکی وردی دەقاودەقی چوارینەکانی خەییام بکات ، بەڵکو هەوڵی داوە چیرۆکێکی هەڵبەستڤانیی (بەیت) ی درێژ بەشێوازی رۆژهەڵاتییانە ، کە لەو سەردەمەدا لەنێو شاعیرانی بەریتانیدا باوبووە بهۆنێتەوە ، کەچی وێڕای ئەوەش کەس تانە لە شاعیرییەت و رەوانبێژیی فیتزجیراڵد نادات ، کە بەخۆی لە نامەیەکدا بۆ (کاوەل) ی مامۆستای ئێژێ : " پاچڤەکەم لە رووی فۆرم و هەندێ رووی ترەوە لە ناوەڕۆك دوورکەوتۆتەوە لە دەقە ئەسڵییەکە ، چونکە هەندێك لە چوارینەکان توانەوە و یەکیانگرتەوەو هەندێکیان تیاچوون " و " چوارینەکانم دەستکاری کردووەو ئاوێتەی یەکترم کردوون و، دەترسم هەندێك لە سادەیی ماناو سانایی وشەکان کە لە تایبەتمەندییە هەرە گرنگەکانی خەییامن ونبووبن "

فیتزجیراڵد هەر بەو (٧٥ چوارینەیەوە ، چاپی یەکەمی ساڵی (١٨٥٩) نەوەستا، بەڵکو لە هەر سێ چاپەکەی دواتریدا زیاد وبژاری کردوون ، تا لەسەر (١٠١ چوارینە) گیرساوەتەوەو، رەوتی بژارکردنەکەشی بەم جۆرە بوو:

(١١٠ **چوارینە/ چ** ١٨٦٨/٢)،

(١٠١ **چوارینە/ چ** ١٨٧٢/٣)،

(١٠١ **چوارینە/ چ** ١٨٧٩/٤)

پاش مردنیشی لەگەڵ کۆبەرهەمەکانیدا لە ساڵی ١٨٨٩ دا بە (١٠١ چوارینە) لەسەر چاپی چوارەم ، چاپی پێنجەم کراوە .

ئیدی دەیان چاپی تری بڵاوبۆوە لە دوا دەیەی سەدەی نۆزدە و بە درێـژایی سـەدەی بیستەم و، لە دەیەی یەکـەمی سـەدەی بیسـت ویەکـدا، تەنانـەت لەسـەر ماڵپـەڕە ئینتەرنێتییەکان...

**مەسعوود فەرزاد** پێی وایـە " فیتزجیراڵـد نـەهاتووە چـوارینەکان یـەك بـە یـەك پاچڤەبکات و، گوێیشی بەوە نەداوە کە ئەم چوارینە یا ئەو چوارینە هی خەییامە یان هی ئەو نیە، واتە بێ گوێدان بەوەی کە گەلێك لەو چوارینانە دراونەتەپاڵ شـاعیرانی دیکـە، کەوتۆتـە سـەریان و، کردوونـی بـە هـەوینێکی هزریـی بـۆ چـوارینەکانی مەنزوومەکەی (بەیتەکەی) خۆی " بەگوێرەی ئاماژەی مامۆستا یووسـف بـەککار، بۆیـەش باسـکارو پاچـڤەوانی ئێرانـی دکتـۆر ئیعتیصـام زادە رەخنـەی تونـدی لـە فیتزجیراڵد گرتووە ، کە بەو بەیتەی (مەنزوومە) خۆی بناغەی هونـەری و تـەکنیکی سەرلەبەری چوارینەی فارسـی رووخانـدووە و، بـەوەی تۆمـەتبارکردووە کـە تـاوانی دەرهەق بە خەییام کـردووەو غـەدری لێکـردووە ! بـەڵام د.دینسـون رۆس ستایشـی پاچڤەکەی فیتزجیراڵد دەکات و دەڵێ : " لە جوانیدا لە شیعری خەییام کەمتر نیـە ، شێوازەکەشی لە کەموکووڕی و خـەوش بـەدەرە و، چـوارینەکانی وێنەیـەکی روونـی سرووشی خەییامە ، یـان لـەدایکبوونێکی تـری سرووشـی ئـەم شـاعیرە فارسـەیە . هەڵبەتە فیتزجیراڵد توانیویەتی دیـوانی چـوارینانی فارسـی بگۆڕێـت و بیکـات بـە داستانێکی یەکپارچـەی یـەکگرتووی هەڤبەنـد و، چـوارینەکانی خـەییامی کردۆتـە رشتەیەك بە یەك داوەوە ، دوای ئەوەی کە خەییام بە پچڕاوەیی و پەرتەوازەیی بەجێی هێشتبوون "

جا بەم جۆرە بۆمان بەدیاردەکەوێ ، کە بەیتەکەی فیتزجیراڵد پاچڤەیەکی ئـازادە و پابەندی دەقە فارسییەکەی خەییام نیە .

**ئیـدوارد هـیرۆن ئـەلن** لـە سـاڵی ١٨٩٩ دا کتێبێکـی زانسـتیانەی وردی دەربـارەی پەیوەندی چوارینەکانی فیتزجیراڵد بە چـوارینە فارسـییەکانی خەییامـەوە نووسـیوەو ئەمەی هەڵێنجاوە :

(١) (٤٩ چوارینە) یان پاچڤەیەکی ئازادی جوانن ، کە لە دەستنووسەکانی (بودلییـان) یان(کیلکەتا) وە پاچڤەکراون .

(٢) (٤٤ چوارینە) راست تر وایە پاچڤەکەیان بە (چوارینەی لێکدراو) ناوبنرێ ، چونکە هەر یەکێکیان لە دوو چوارینە یان زیاتر وەرگێڕدراون .

(٣) **دوو** چوارینەیان ، لە دوو چوارینەوە پاچڤەکراون کە تەنیا لەچاپی (نیکـۆلاس) ی فەرەنسیدا هەن .

(٤) **دوو** چوارینەیان رەنگدانەوەی روحی هەموو شیعرەکانی خەییامن .

(٥) **دوو** چوارینەیان لەژێر کاریگەری هەندێ بەیتێن (مەنتیقو لتەیر= گوتەی مەل) ی فەریدەددین عەتتاری نیشابووری دان .

(٦) **دوو** چوارینەیان لەژێر کاریگەری غەزەلەکانی حافزی شیرازیدان .

(٧) **دوو** چوارینەیان ئەسڵیان لە چاپی یەکـەم و دووەمـی وەرگێڕانەکـەی فیتزجیراڵـدا نادیارە.

فیتزجیراڵد بەتەواوەتی پشتی بە هەردوك دەستنووسی (بودلییـان/ ١٥٨ چـوارینە) و (کیلکەتا/ ٥١٦ چوارینە) بەستبوو. بە هەر حاڵ لە ستایشـی بەیتەکـەی فیتزجیراڵـدا گوتوویانــە بــەناوبانگترین وەرگێڕانــی بەرهــەمێکی رۆژهەڵاتییــە و، جــوانترین و بەناوبانگترین وەرگێڕانە لە زمانی ئینگلیزیدا لەدوای (کتێبی پیرۆز) کە بـە نموونـەی رەوانبێژی لە زمانی ئینگلیزیدا دەژمێردرێت .

دیاره پێویسته ئەوه لەبەرچاو بگیرێ کە فیتزجیرالد پەیجۆرێك نـەبووه هەولێـدابێت چوارینه رەسەن و ئەسلێیەکانی خەییام بدۆزێتەوه ، بگره وەرگێڕێکی زۆر شارەزاش له زمانی فارسیدا نەبووه ، تا چوارینەکان بەشێوەیەکی وردی نزیك لەدەقه فارسـییەکان پاچڤەبکات ، وەلیٚ عەلی دەشـتی گوتـەنی : " پـڕ بـەمانای وشـه شـاعیر بـووەو، کاریگەرییەکی ئەوتۆی چوارینەکانی بەسەرەوه بووه ، کە بچێته پێستی خەییامـەوەو شاعیرییەتی ئەو بنوێنێتەوەو ئەم شاکاره بئافرێنێت "

کەواته فیتزجیرالد شاعیرو پاچـڤەوانێکی ئـازاد بـووەو ئـەم شـاکاره هونەرییـەی دارشتۆتەوه ، بیٚ ئەوەی گوێبداته ئەمانەتداری و وردی له وەرگێڕانـداو، بـیٚ ئـەوەی گویٚ بەوه بدات که ئەم یان ئەو چوارینەیه بەڕاستی هی خەییامه یـان نـا . ئەمـه و جگه لەوەی تەنیا دوو دەستنووسەکەی (بودلییان) و (کیلکەتا) ی لەگـەڵ چـاپەکەی (نیکۆلاس) ی فەرەنسیدا لەبەر دەست بووه .

گەرچی فیتزجیرالد یەکەم ئەورووپی نەبووه کە چوارینەکانی خەییامی وەرگێڕابێت ، چونکه خەڵکانی تر له نەمسا و فەرەنسا و بەریتانیا به دەیـان سـاڵ لـەو مەیدانـەدا پێشی کەوتبوون ، بەڵام به پاچفەی پاژییانه و له ئاستێکی تەنگدا، گەرچی بەیتەکەی فیتزجیرالد له دوا چاپی بژارکراویدا له(١٠١ چوارینه) تێ نەپەڕیوه ، له هەشتایەکانی سەدەی نۆزدەیەمەوه بووەته بناغەی زۆربەی پاچڤە رۆژئاوایی و رۆژهەڵاتییەکان ، که ژمارەیان بەدەیانه . بۆ زانینش ژمارەی ئـەو چـوارینانەی خـەییام کـه بـۆ زمـانێن ئـەورووپایی پاچـڤەکراون لـەنێوان (١٠١) و(٥٠٠) دایـه . فیتزجیرالـد (١٠١) دانـەی وەرگێڕاوه و ئیدوارد هنری وینفیلد (١٨٣٦- ١٩٢٢) (٥٠٠) دانه و جۆن ئـاربری (٢٥٢) دانەی وەرگێڕاوەو دوا وەرگێڕان (٢٣٥ چوارینه) یه له لایەن پیتەر ئیووری (ل : ١٩٢٣) له هەشتایەکانی سەدەی بیستەمدا و، پـێش ئـەوەش پاچـڤە هاوبەشـەکەی رۆبێـرت

گرەڤز (١٨٩٥- ١٩٨٥) و عەلی شا لە ساڵی ١٩٦٨ دا بڵاوبۆتەوە ، کە لە سەنعەتبازیی و دەستکردییەوە دوورە .

هەر لێرەشدا جێی ئاماژەیە ، کە پاچڤەی ئێرانییەکان خۆیان بۆ زمانێن بیانی نەگەیوتە ریزو شۆرەتی پاچڤە ئەوروپییەکان ، هەروەها هیچ پاچڤەیەکی ئەوروپیش (کە بە دەیان و پتریشن) نەگەییوەتە ئاستی شۆرەت و ناوبانگی بەیتەکەی فیتزجیراڵد.

دیارترین پاچڤەی جیددی ئێرانی بۆ زمانی دی **The wine of Nishapur** (شەرابی نیشابوور) ە ، کە (٧٢ چوارینە) یە بە پاچڤەی کەریم ئیمامی (١٩٣٠- ٢٠٠٥) و، بە پێنج هەزار نوسخە بڵاوبۆتەوە ، هەروەها پاچڤەی فەرەنسی لەلایەن فوئاد رووحانییەوە ، کە ئەویش بەپێنچ هەزار نوسخە بڵاوبۆتەوە و، هەردوو پاچڤەکە هاوکات لە ساڵی ١٩٨٨دا دەرچوون و لە ئەوروپاو ئەمریکادا پەخشکرانەوە ، کەچی لە ئێراندا، بە هۆی کێشەی رۆمانی (ئایاتی شەیتانی) سەلمان روشدییەوە ، بڵاونەکرایەوەو، هەردوك وەرگێڕانەکە ، بە کۆمەڵێك وێنەی فۆتوگرافی (شاهرۆخ گولستان) ی وێنەگر و هونەرمەندی سینەمایی و رەخنەگری ئێرانی بەناوبانگ - **کە دەمێکە ئاکنجی پاریسە**- رازێنراونەتەوە .

پاچڤەکەی ئیمامی ئەمانتەداریی و وردییەکی زۆری تێدایە و زۆر لە دەقە فارسییەکەوە نزیکە ، بەڕادەیەك دەتوانرێ بە ئاسانی دەقی ئەسڵی هەر چوارینەیەك بەتەواوەتی بناسرێتەوە ، بە پێچەوانەی پاچڤەکەی فیتزجیراڵد کە زۆربەی لە دەقە فارسییەکەوە دوورە .

لێرەش پێویستە ئاماژە بۆ پاچڤەیەکی پاشتر بکەین کە هی سەعید سەعیدپووری پاچڤەوانی بەناوبانگە، کە لە ساڵی (٢٠٠٢) لە تاران بڵاوبۆتەوە و، رەنگە پەڕتوکی

(شەرابی حیکمەت، شیعرو فەلسەفەی خەییام) دانان وپاچڤەی مەهدی رەزەوی بە ئینگلیزی کە لە ساڵی ٢٠٠٧ بلاوبۆتەوە، دوایەمین پاچڤە بێت بۆ ئینگلیزی .

## ژۆکۆڤسکی و چوارینە گەڕۆکەکان

رۆژهەلاتناسی رووسی ڤالەنتین ژۆکۆڤسکی (١٨٥٨- ١٩١٨) رێبازی تایبەتی خۆی بۆ هەلاوێردنی چوارینە رەسەنەکانی خەییام لە چوارینە غەوارە و ئاوەکییەکان گرتۆتەبەر، ئەویش بە وردبوونەوە و بەراورد کردنی چوارینانی شاعیرانی دوای سەردەمی خەییام ، کە هەر جارێ چوارینەیەکی خەییامی لەناو دیوانی هەر شاعیرێکی تردا دۆزیبایەوە ، گومانی لە رەسەنایەتی دەکرد ، تا ژمارەی ئەو چوارینە گومانبارانە (بەڕای ئەو) لەنێو کۆمەڵە چوارینەکانی نیکۆلاسدا کە ژمارەیان (٤٦٤ چوارینە) یە گەیشتە (٨٢ چوارینە)کە لە نێو دیوانێن شاعیرانی تردا دۆزیبوونیەوە و، ناوی نان (چوارینە گەڕۆکەکان) و، پاشان رۆژهەلاتناسی ئینگلیزی ئیدوارد ئەنیسون رۆس (١٨٧١- ١٩٤٠) و رۆژهەلاتناسی دانیمارکی کریستنسن گەیاندیانە (١٠١ چوارینەی گەڕۆك) کە گوایە هی شاعیرانی ترن ، لەوانە : ئەنوەری (؟ ١١٢٦- ؟ ١١٦٩)، عەتتار (؟ ١١٤٢- ١٢٢٩)، نەصیرەددین تووسی (١٢٠١-١٢٧٤)، مەجدەددین هەمگر (م : ١٢٧٩)، بابا ئەفزەڵ کاشانی (؟ ١١٨٦- ؟١٢٦٧)، شێخ عەبدوڵلا ئەنصاری (١٠٠٥-١٠٨٨) و حافزی شیرازی (؟١٣١٧-؟ ١٣٩٧) و شاعیرانی دیکە...

بۆ نموونە دەبینین ئـەم دوو چـوارینەیە کـە دراونەتـەپاڵ شـێخ ئەنصـاری ، زۆر لـە هزرینی ئەنصارییەوە نزیکن و لە پەیڤینی ئەو دەچن، تەنانەت ئەگەر لە دیوانەکەشیا نەبن. چوارینەکان بەم دوو نیوە بەیتە دەستپێدەکەن:

× " من بندهء عاصیم رضای تو کجاست؟"

من بندەء یاخیم رەزای تۆ لە کوێیە؟

× " گر از پی شهوت و هوا خواهی رفت "

ئەگەر لە دووی ئالۆشیی و هەوەسبازیی بچی

**بۆزانین چوارینەی یەکەم دراوەتەپاڵ شێخ (ئەبوولخەیر) یش .**

وادیارە ژۆکۆڤسکی لەم ڕێبازەدا هەندێك سەرکەوتووەو توانیویەتی ژمارەیـەکی بەرچاو لە چوارینە تێخزاوەکانی نێو چوارینەکانی خەییام بـژاربکات و خاوەنـەکانیان دەسنیشانبکا وەك ئەمانە :

× " من می خورم و هرکه چون من اهل بود..."

من مەی دەنۆشم و هرکە میناکم شایستە بێت/ **(ڕاڵب ئامولی ، م : ١٦٢٦).**

**(ئەم چوارینەیە لەراستیدا هی سیراجەددین قومری یە/ ج. ز)**

× " گویند بهشت و حور و کوثر باشد..."

ئێژن لەوێ بەهەشت و پەری و کەوسەر دەبێ/ **(مەجدەددین هەمگر)**

× " ای بی خبران جسم مجسّم هیچ است..."

ئەی غافڵان تەنی بەرجەستە هیچە/ **(نەصیرەددین تووسی)**

**(ئەم چوارینەیە لە پەیڤینی خەییامەوە نزیکترە/ج.ز)**

لەگەڵ ئەوەشدا ژۆکۆڤسکی بەهۆی سەپاندنی میتـۆدە دوگمائییەکەیـەوە کەوتۆتـە ئەو هەڵەیەوە کە ژمارەیەك لە چوارینە ڕەسەنەکانی خەییام بداتەپاڵ شاعیرانی دیکە، هەر لەبەر ئەوەی کە لە دەسنووسی دیوانەکانی ئەوانیشدا هەبوون وەك :

"ترکیب پیاله کی درهم پیوست..." کـە دراوەتـەپاڵ نەصـیرەددینی تووسـی و، هەرگیز لەگـەڵ جـۆری تێهزرینـی ئـەودا ناگونجێـت . هـەروەها هەنـدێ چـوارینەش دراونەتەپاڵ حافزی شیرازی ، کە بەهیچ کلۆجێ لەگەڵ سرووشتی ئەوا تێکناکەنـەوە ، تەنانەت ئەگەر گومان لە ڕەسەنایەتییە خەیامییەکەشیان بکرێ وەك :

" آن قصر که بر چرخ همی زد پهلو..."

ئەو کۆشکەی تەنگی بەفەلەك هەڵچنیبوو.

یان لە چوارینە گومانبارو ڕەفزکراوەکانیش وەك :

" آنم که پدیدگشتم از قدرت تو..."

ئەوەم کە بە توانای تۆ ئافرێنرام

کەچی چوارینەیەکی دی هەیە هەموو سیماکانی شێوازی خەییامی تێدایە وەك :

" چون عهده نمی شود کسی فردا را..."

چونکە سبەینێ بۆ کەس دابین نەکراوە

ژۆکۆڤسکی داویەتیەپاڵ فەریدەددینی عەتتار، کەچی هیچ لێکچوونێکی بە جۆری هزرینی عەتتارەوە نیە .

ئیدی گەلێك لەم جۆرە پاشاگەردانی و دانەپاڵانە کراوە، ئەم چوارینانەی خوارەوەش هەر بۆ نموونەو سوودی زیاتر دەخەینە ڕوو، کە دراونەتەپاڵ حافزی شیرازی :

× " از آمدن و رفتن ما سودی کو؟..."

لە هاتن و چوونمان چ سوودێك هەیە؟

× " آن قصر که جمشید در او جام گرفت..."

ئەو کۆشکەی جەمشید پیاڵەی هەڵئەدا تیا.

ئەم تێکەڵ و پێکەڵکردنە هەر باسکارانی بێگانەی وەك ژۆکۆڤسکی نەگرتۆتەوە ، بگرە زۆر لە باسکارە ئێرانییەکانیش ، کە زۆر لە چوارینە ئەسڵی و رەسەنە خییامییەکانیان لە خەییام دوورخستۆتەوە و، ژمارەیەکی زۆری چوارینەی ئاوەکی و غەوارەیان بەناوی خەییامەوە تۆمارکردووە ! بۆ نموونە باسکار ئەمیر خنجی (١٨٤ چوارینە) ی خەییامی و لەوانەی دراونەتەپاڵ خەییام هەڵبژاردووە و بە پێی ئەلیفبا ریزبەندی کردوون و (٢٥ چوارینە) ی وەلاوەناوە ، کە (١٠ چوارینە) یان بەدڵنیاییەوە لەچوارینە ئەسڵی و رەسەنەکانی خەییامن ( لە دیوانی خەییام بە کوردی پاچڤەکراون) و بەم نیوە بەیتانە دەسپێدەکەن :

× " عمریست مرا تیره و کاریست نەراست"

× " گر شاخ بقا ز بیخ بختت رستەاست"

× " از رنج کشیدن آدمی حرگردد "

× هر راز که اندر دل دانا باشد"

× " تا راه قلندری نپویی نشود "

× "این اهل قبور خاك گشتند و بخار"

× " من می نه زبهر تنگدستی نخورم "

× ای دیده اگر کور نەای گور ببین "

× یك جرعه می کهن ز ملکی نو به "

× " از کوزەگری کوزه خریدم باری "

پەیجۆری زانا جەلالەددین هومایی لە پێشەکیی (**تەرەبخانە**) دا چەند نموونەیەکی لەم جۆرە وردبوونەوەو هەڵێنجانەی خستۆتەڕوو: " کە لەبەر پتر لە هۆیەك ، لـە هـەموو ئەوانی دی پەسەندترە و پتر جێگەی باوەڕو متمانـەو دڵنیاییـە، چـونکە خـودان رای بنجبڕە ، وێڕای فرەزانی و وردبینیی لە زانینی شێوازێن هۆزانان و تـەرزی تێهزرینـی خاوەنەکانیان . بەڵام ئەوەی جێی داخـە، کـە ئـەو نموونـە زۆرانـەی بـەس بـۆ ئـەوە هێناوەتەوە بیسەلمێنێ ، کە زۆربەی ئەو چوارینانەی دراونەتەپاڵ خەییام ، لە دیوانێن هۆزانڤانـانی دواتـردا پەرتـەوازە و پەراگەنـدەن . بەهـەر حـاڵ ، ئـەم رێبـازە ئەنجامگیرییەکی بنجبڕ و مکوومی لێ ناکەوێتەوە " بەپێی قسەی مامۆستا دەشتی.

جا دەبێ لە بیر نەچێت، کە ئەم تێکەڵ و پێکەڵکردنە لە بواری چوارینەاندا فرەیـە ، هەر بۆ نموونە :

بەپێی پشکنین و ساغکردنەوەی پـەیجۆری گـەورە سـەعید نەفیسـی (١٨٩٥- ١٩٧٥) (٧٢٦ چوارینە) دراوەتەپاڵ شێخ ئەبوو سەعید ئەبوولخەیر (٩٦٧- ١٠٤٩ ز) کەچی (١٨٣ چوارینە) یان هی ئەم شاعیرە ناسراوەو شاعیرانێکی دیکەن : (٥٥) خەییام ، (٤٠) بابا ئەفزەڵ ، (٣٠) مـەولانا جەلالـەددین ، (٣٥) ئەوحـەدەددین کرمـانی ، (٢٣) عـەلی باخەرزی و (٤٣) شاعیری تر...ئینجا نزیکـەی (٥٠٠ چـوارینە) کـە ماونەتـەوە هـی شاعیرانێکی نادیارن ! چـونکە بـەپێی باسـی نڤیچـرکی ئەبوولخـەیر **محەمـەد** کـوڕی منەووەر لە کتێبی (نهێنییەکانی یەکتاپەرستی)دا شـێخ ئـەبوو سـەعید بەدرێـژایی تەمەنی تەنیا چوارینەیەك و دێڕێکی شیعری هۆنیوەتەوە!!!

هەروەها ئەو (١٩٩٥ چوارینە) یە لە دیـوانی (شەمسـی تـەبریزی) ی جەلالـەددینی مەولەویدایـە ، نیوەیـان بەدڵنیاییـەوە هـی ئـەو نـین ! زانـای پـەیجۆر بـەدیع

فروزانفەر(١٨٩٧- ١٩٧٠) زۆر تێکۆشاوە بۆ ساغکردنەوەی ئەو دیوانە گەورەیە ، کەچی (١٩٨٣ چوارینە) ی هێشتۆتەوە و، لە پێشەکییە زانستییە بەهادارەکەیدا روونی کردۆتەوە ، کە هەموو ئەم چوارینانە هی مەولانا جەلالەددینی مەولەوی نیە و، باسکارانی دیکە (١٦٥٩ چوارینە) بە هی مەولانا دەزانن ، هەر بۆ نموونە ، ئەم چوارینانەی خوارەوە کە بەو بەیت و نیوە بەیتانە دەستپێدەکەن (لەوەیە بە سووکە جیاوازییەکەوە) دەدرێنەپاڵ خەییام و شاعیرانی دیکەش :

× " گویند فردوس برین خواهدبود

آنجا می ناب و حور عین خواهدبود"

× " یکچند بکودکی به استاد شدیم "

× " رندی دیدم نشسته بر خنگ زمین "

× " از حادثهء جهان ز آینده مترس "

دیارە ئەمەش دگەڵ (حافزی شیرازی) دا روویداوەو شیعری شاعیرانی دیکە خراوەتە نوسخە دەستنووسەکانی دیوانەکەیەوە. هۆی ئەمەش لە روانگەی رۆژهەڵاتناس (ئاربری) یەوە ئەمەیە کە : " زۆر ئاساییە کە شیعری شاعیرانی دیکە بدرێتەپاڵ شاعیرێکی ناودار، چونکە ئەوە لەبارترو باشتر بووە " (دەشتی) ش بۆ ساغکردنەوە و نەهێشتنی ئەم کیشەیە جەخت لەسەر ئەوە دەکات ، کە دەبێ زیاتر شێوازو جۆری هزرینی شاعیرە ناودارو گەورەکە لەبەرچاوبگیرێ ، پتر لە دەستنووس و دیوانەکان کە هەرەمیانە کۆکراونەتەوە و نووسراونەتەوە، چونکە پشتبەستنی پەتی بە دەستنووسان بێ رەچاوکردنی لایەنانێکی دی، باسکار تووشی هەڵەی زەق دەکات، وەك لەگەڵ یەکێك لە خەییامناسە رێزدارەکاندا روویداوە ، کە باسکاری تورکی (عەبدولباقی

گولپینـارلی) یـە ، کـە (٩ چـوارینە) ی لـە دەستنووسـێکدا بـەناوی خەییامــەوە دۆزیوەتەوە و بێ چەندو چوون خستوونیەتە سـەر چـوارینەکانی خـەییام، کەچـی لـە پەیڤینی خەییامەوە نزیك نین، لە کاتێکا (٤ چوارینە) ی رەسەنی خەییامی لابردووە، تەنیا لەبەر ئەوەی لە دەستنووسـێکدا، لـەزانکۆی ئەسـتەمووڵ ، دراونەتـەپاڵ بابـا ئەفزەڵی کاشانی ! کەچی لەڕووی شێوازو هزرەوە خەییامی تەواون و، زۆر لـە هـزری بابا ئەفزەڵەوە دوورن و، لە سەرچاوە دێرینەکاندا بەناوی خەییام تۆمارکراون، ئەمەش نیوەبەیتێن دەستپێکەکانیانە:

× " در دایرەء کآمدن و رفتن ماست "

× " دارندە چو ترکیب چنین خوب آراست "

× " ترکیب طبایع چو بە کام تو دمی ست "

× " ترکیب پیالەیی کە درهم پیوست "

جا بەگوزارشتی دەشتی " نووسەرەوەکانی کۆشیعرو کەشکۆڵان ، بەتایبەتی ئەگـەر لە ئەهلی زمانە ئەسڵەکە نەبن ، هەندێ جار شتی زۆر سەیروسەمەرە دەکەن ، وەکـو ئەوەی کە نووسەرەوەیەکی تورك لـە سـاڵی (٩٤٧ ك = ١٥٤٠ ز) دا کردوویـەتی ، کـە کۆمـەڵێك چـوارینەی بـەناوی خەییامــەوە لـە وەسـفی پیشـەوەراندا کۆکردۆتـەوە : پینەدۆز، نانەواو جۆلا...! هەڵبەتە هەمووی چوارینەی بازاڕی و پووچ و دوور لە هەر چێژێکی ئەدەبین "

# خەییامەکەی کریستنسن

ئاشکرایە کە ئارتەر کریستنسن (١٨٧٥- ١٩٤٥) جەختکارترین توێژەری ئەوروپییە لە لێکۆڵینەوە تیرۆتەسەلەکانیا دەربارەی چوارینەکانی خەییام ، جگە لە لێکۆڵینەوەکانی دەربارەی مێژووی ئێران و تایبەتمەندییە نەتەوەییەکانی ئێرانیان و، چێژو سەلیقەی ئەدەبییان، ئەوە دەنوێنن کە شارەزاییە فرەی لە ئەدەبییاتی ئیرانیدا هەبووە ، بەلاّم مەخابن ئەوکاتە لەسەرەتاکانی سەدەی بیستەمدا (١٩٠٤ ز) لەبەر کەمی چاڤکانییێن دەستنووسی راستەوخۆ پەیوەست بەچوارینەکانی خەییامەوە ، کەپاشان لێرەو لەوێ دۆزراونەتەوە مینا (مونس الاحرار) و (نزهه المجالس) کە دوو سەرچاوەی یەگجار پڕ بەهان ، نەیتوانیوە وەکو پێویست نیشان بپێکێت. جا بەو جۆرە کریستنسن گومانی پتری لەو نوسخە دەستنووس و چاپکراوانەی بەر دەستی پەیداکرد ، کە کەمیش بوون و، یەکێکیان (٧٠٠ چوارینەی سەیروسەمەرەی لەخۆگرتووە) وباشترینیان کۆمەڵەکەی نیکۆلای فەرەنسییە (٤٦٤ چوارینەیە) لە شاعیرانی جیاوازەوە کۆی کردوونەتەوە و هیچ جۆرە شێلگیرییەك لە نێوانیاندا نیە ، تەنانەت کریستنسن بەخۆیشی بەزەبری هەستی رەسەنی رەخنەگرانەی خۆی کەوتووبوە گومانەوە کە زۆربەی رەسەن بن و، پەیڤینی پەیجۆری رووسی ژۆکۆڤسکی بە بەلگە هێناوەتەوە : " ئێستا خەییامی فەیلەسووف و زانا بەجێی خۆی ، هەقمان بەسەریەوە نیە ، بەلاّم ئاخۆ دەشێت کەسێکی خاوەن هەستێن تایبەتی ئەو هەموو وێنا هەڤدژو بابەتە ناکۆکانەی لێ بکەوێتەوە : ئاکاری باش و بەد ئاکاری ، رەفتاری شەریف و شەهوەتبازی ، هزری مەزن لە بوارێن ژیان و تێوەگلان لە پۆخلّەواتی بازاڕییەوە...؟ !" کریستنسن لە وەلاّمی

ئەم پرسیارەدا هۆی ئەم هەڤدژی و تێکەڵ و پێکەڵەیە دەگەڕێنێتەوە بۆ نائەسڵبوونی زۆربەی ئەو چوارینانە . بۆ سەلماندنی بۆچوونەکەشی سووکە سەرنجێکی وردو بەجێ پێشکەشدەکا ، کە ئەمەیە : کۆنترین نوسخەی چوارینەکانی خەییام نوسخەی (بودلییان) ـە کە لە ساڵی (٨٦٥ ك = ١٤٦٠ ز) دا تۆمار کراوەو (١٥٨ چوارینە) ی بەناوی خەییامەوە لەخۆگرتووە ، کەچی ژمارەی ئەو چوارینانەی بەناوی خەییامەوە لە دەسنووسەکانی دواتردا، کە لە سێ سەدەی (١٦،١٧، ١٨ ز) تۆمارکراون گەییوەتە (٨٠٠ چوارینە)، ئینجا دەپرسێت : " ئەگەر لە ماوەی ئەو سێ سەدەیەدا ژمارەی ئەم (١٥٨ چوارینە) یە گەیشتبێتە (٨٠٠ چوارینە)، جێی خۆی نیە گومان لە (١٥٨ چوارینە) کەی نوسخەکەی ( بودلییان) یش بکرێ ، کە دوای نزیکەی سێ سەدە و نیو پاش مردنی خەییام تۆمارکراون ؟ ! " پاش ئەو وردە سەرنجە بەجێیە ، کریستنسن نۆڕین و بۆچوونێکی شایستە دەخاتەڕوو " وێڕای گومان لە رەسەنایەتی ئەم چوارینانە ، نکۆڵی لە بایەخی مێژوویی و شیعرییان ناکرێ و بەهایان کەم نابێتەوە . واتە دەبێ لە خەییام جیابکرێنەوە و، لە هەمان کاتدا بە زادەی روحی ئێرانی گوزارشتکەر لە شۆڕشە سیاسی و ئایینی و ناکۆکییە ئیدۆلۆجی و کێشماکێشە گەرمانە بژمێردرێن کە هەمیشە لەنێوانیاندا هەبووە" و " دەتوانین لە رێگەی چوارینە (ژۆکۆڤسکی گوتەنی : گەڕۆکەکان) کە دراونەتەپاڵ خەییام و، لە دیوانێن شاعیرانی تردا هەن ، ئەو دەرەنجامە هەڵێنجێنین کە چوارینە سۆفییەکان و ئەوانەی غەزەل و عیشقیان تێدایە ، ئاوەکین و دواتر دراونەتەپاڵ خەییام "

بەڵام ئارتەر کریستنسن ، وێڕای شێوازە رەخنەییە وردەکەی ، کەوتۆتە هەڵـەوە بـە هۆی ئەو ( پێوەر) ەی بۆ هەڵاوێردنی چوارینە رەسەن و ئاوەکییەکان بەکاری هێناوە، کە هەر چوارینەیەك ناوی خەییامی تێدا هەیە (کە ١٢ چوارینەن) بـەهی خـەییامی ژماردووە . کەچی نادروستی ئەم گریمانەیە زۆر دیارو زەقـە ، چـونکە زۆرینـەی ئـەو چوارینانە هی شاعیرانی دیکەن و، لە روانگە دۆستایەتی یـان دژمنایەتیـەوە باسـی خەییام دەکەن یان دەیدوێنن . هەڵبەتە " لەو ١٢ چوارینەیەی کە ناوی خەییامی تێدا هاتووە ، هەندێ نیشانە هەن ، ئەوە دەگەیەنن کە زۆربەیان هی ئەو نەبن ، بگرە زۆر روونە کە هەندێکیان وەڵامدانەوەی خەییامن، هەندێکیان دژی خەییامن و هەندێکیان بەرگری لێی دەکەن و هەندیکیان لاسایکردنەوەی خەییامن " وەل ئەوەشـدا دەشـێت دوو سێیەکیان هی خەییام بن .

چونکە کریستنسن پاشتر سەرچاوەی زۆرتـرو گـرنگتری دەسـتکەوت ، درێـژەی بـە پرۆژەی لێکۆڵینەوەکەی دا و، لەساڵی ١٩٢٧ دا کتێبێکی تری دانـا ، کـە بـووە تـاجی سەری تۆژینەوە و لێکۆڵینەوەکانی ، ئیـدی بازنـەی لێکۆڵینەوەکـەی (١٨ نوسـخەی دەستنووس) ی گرتەوە و، لە تێکرای کۆی (١٢١٣ چوارینە) ی ئەو دەسنووسـانە (١٢١ چوارینە) ی هەڵبژارد . دیـارە رێبـازی هەڵبـژاردنی ئـەم چـوارینانە خـۆی لەخۆیـدا بەڵگەی تێژبینی و هەستیاریی رەخنەیی کرسیتنسنە .

گەرچی کریستنسن ژمارەی چوارینە (گەڕۆکـەکان) کـە بـە پێـی ژۆکۆڤسـکی (٨٢ چـوارینەن) گەیانـدە (١٠١ چـوارینە) سـوودێکی ئـەوتۆ لـەم هەوڵـەدا نابینێـت بـۆ جیاکردنەوەی چوارینە ئاوەکییەکان لەچوارینە رەسەن و ئەسڵییەکانی خەییام . ئەوجا " لە چوارینە سۆفییەئامێزەکان کـە دراونەتـەپاڵ خـەییام گومانـدارە ، چـونکە بـە نۆڕینی ئەو چەند مێژووی دەسنووسەکان دواتر بووبێت ، ژمارەی ئـەو چـوارینانەش

زیاتر دەبێت . هەروەها دڵنیـاش نییـە لـەو کۆچـوارینانە کـە بـە گـوێرەی ئـەلیفبا ریزبەندکراون ، چونکە نووسەرەوەکان (نووسخەنووسەکان) تا سەدەی  نۆیەمی کۆچـی پەیڕەوی ئەم سیستەمەیان نەکردووە و، هەموویان حەزیانکردووە خـەییام چـوارینەی بەگوێرەی هەموو پیتەکانی ئەلیفبا هەبووبێ ، بۆیە ئاسانکارییان لەقەبووڵکردنی زۆر چوارینەدا کردووە . بەڵام ئەو کۆچوارینانەش کە بەگوێرەی  بابەت ریزبەنـدی کـراون (وەك : وەسفی خوای تەعالا، یەکتاپەرستی، تۆبە، پاڕانەوە... متمانەی زۆریـان پـێ ناکرێ "

گەرچی کریستنسن تەنانەت لە دێرینترین سەرچاوەکانیش بەگومانە ، لێ پـەیڕەوی پێوەری (دووبارەبوونەوە) ی کردووە ، واتـە دووبارەبوونـەوەی ئـەم چـوارینە یـا ئـەو چوارینە کە لە سەرچاوە جیاوازەکانەوە دراوەتەپاڵ خەییام. دگەڵ ئەوەشـدا " بـوون و دووبارەبوونەوەی چوارینەیەك لە زۆربەی دەسنووسەکاندا بەڵگەی رەسـەنایەتی نیـە ، نەخاسمە ئەگەر لەگەڵ نیشانەکانی خەسڵەتێن تایبـەتی زانایـەکی مینـاك خـەییام و رێبازی چۆنیەتی تێهزرینی تێکنەکاتەوە . کریستنسن بەخۆی هەنـدێ جـار هەسـتی رەخنەوانی خۆی خستۆتە کـار و، بنجبڕانـە رەفزیکـردووە کـە هـەفتامین چـوارینەی نوسخە دەسنووسەکەی (بودلییان) هی خەییام بێت " بەڵکو هی (مەهستی گەنجەوی) شـاعیرەی نـاودارە ، کـە سـەرپێیانە بـۆ پێشـوازیی سـوڵتان سـەنجەری سـەلجووقی گوتوویەتی و، بەم نیودێڕە دەسپێدەکا :

" شاها فلکت به خسروی تعیین کرد..."

- ئەی شا فەلەك تۆی کردۆتە پاشا..

جا به قسـەی مامۆسـتا دەشـتی : " ئێمـەش دەزانـین کـە زۆربـەی نووسـەرەوەی دەسنووسەکان شەیدا و تاسەمەندی ئەوە بوونە کە زۆرترین چـوارینان کۆبکەنـەوە و، زۆربەی ئەوانەی ئەو کارەیان گرتبووە ئەستۆ خودانی هزرو ئەدەب و زەوقی ساغلەم و تێگەیشتنی قووڵ نەبوونەو، ئەمەش وایکردووە هەر چوارینەیەك دەگەڵ ئاستی هـزرو زەوق و سەلیقەیاندا بگونجێت بە هی خەییامی بژمێرن " واتە هێشتا گومان بەدەوری گەلێك لەم (١٢١ چوارینە) دا دەسوورێتەوە کە کریستنسن بە چوارینە راستەقینەکانی خەییامی ژماردوون .

## دکتۆر رۆزن و ناوی خەییام لە چوارینەکاندا

دکتۆر فردریك رۆزن (١٨٥٦- ١٩٣٥) پەیجۆرێکی مەزنی ئەڵمانی و خەییامناسـێکی گەشە. لە ساڵی١٩٢٥ دا چوارینەکانی خەییامی بۆ زمانی ئەڵمانی پاچـڤەکردووە، بـە پشتەوانەی دەسنووسێکی تۆمارکراوی ساڵی (٧٢١ك=١٣٢١ ز) وە، کە (**٣٢٩** چوارینەی بەناوی خەییامەوە لەخۆگرتووە) دگەڵ ئەو سێزدە چوارینەیەی ( مونس الاحرار...) و (**٦٣** چـوارینەی دیکـە بـەناوی خـەییام) کـە لـە پـەراوێزو دەهمـەنی نوسـخەیەکی دەسنووسی دیوانی حافزی شیرازیدا تۆمارکراون .

دکتۆر رۆزن بە خۆیشی گومانی لە نوسخە دەسنووسەکەی لای خۆی هەبووە چ وەکو خـەت و چ وەکـو کاغـەز ، واتـە ئـەو نوسـخەیە لەسـاڵی (٧٢١ ك = ١٣٢١ ز) دا تۆمارنەکراوە، بـەڵکو پاشـتر لەسـەر نوسـخەیەکی ئەسـڵی نووسـراوەتەوە . ئـەوەی گومانەکەی بەهێزتر کردبوو، ئەوەیە کە هەندێ چوارینانی تێدایە چ وەکو واژەو کـرك

و چ وەکو ناڤەرۆك ئەستەمە بدرێتەپاڵ خەییام و، کریستنسنی توێژەریش لەم خاڵـەدا هەڤڕەئی ئەوە.

دکتۆر رۆزن بۆ هاوێرکردنی چوارینە رەسەنەکان لە چوارینە ئاوەکییەکان پشتی بـەو چوارینانە بەستووە کە ناوی خـەییامیان تێدایـە (ژمارەیـان ١٢ یـە) و، لـە هـەمان کاتیشدا بەپێی هەندێ بەڵگەی بەجێ و پەسند نیوەی لێ لابردوون . ئیـدی ئەوانـەی دیکەی لەگەڵ ئەو سێزدە چوارینەیەی خەییام کە لە (مونس الاحـرار...) و ئـەو دوو چوارینەیەی لە(چاودێرگەی عیباد) و چـوارینەکانی (فـیردەوس لتـەواریخ- ی مـەلا خوسرەوی ئەبەرقووهی ، کە لە دەوروبەری ساڵی (٨٠٨ك = ١٤٠٥ ز) دانراوەو پارچـە عـەرەبیەکانی (نزهەتو لئەرواح) ی شارەزووری ، کـە کۆیـان (٢٥ بـەیت) ـە کردۆتـە پێوەر بۆ ناسینەوەی چوارینەکانی دیکەی خەییام .

ئاشکرایە کە هەموو ئەو چوارینانەی ناوی خەییامیان تێدایە هی عومەر خـەییام نین ، بۆ نموونە یەکێکیان ئەو چوارینەیەیە کە دکتـۆر رۆزن بـەخۆی لـە نوسـخەیەکی دەسنووسی دیوانەکەی جەلالەددینی مەولەوی دۆزیوەتەوە کە بەم نیودیرە دەسپێدەکا:

" این صورت به خیمەای ماند راست"

کە پەرچدانەوەی چوارینەیەکی خەییامە.

هەڵبەتە پتر لـە هۆیـەك هەیـە بـۆ زاوزوێ و زۆربوونـەوەی ئـەو چـوارینانەی کـە دراونەتەپاڵ خەییام ، رەنگە هەندێ جار کەسێکی مەکرباز لاسایی خەییامی کردبێت و چوارینەیەکی هەڵبەسـتبێت و ، بـە نیـازەی کـە بەرپەرچـی ئەوانـە بداتـەوە کـە خەییامیان بە گوناهبار ژماردووەو ، رەنگە خاپینۆکێکی تر بە پشـتەوانەی رەفتـارو

مەشرەبی خەییام، چەند چوارینەیەکی بە زمانی خەییامەوە هەڵبەستبێت ، بەوپەڕی توندڕەوییەوە ، تا دژمنایەتی بۆ زیادبکات! بگرە دووریش نیە هەندێ شاعیری ترسنۆك هەبووبن ناوی عومەر خەییامیان کردبێتە دەمامك ! شاعیرانێکی دیکەش هەبووبن توانای خۆیانیان تاقیکردبێتەوە ، یان لاسایی ئەم چوارینە یان ئەو چوارینەی ڕەسەنی خەییام کردبێتەوە . هەڵبەتە ئەمەش دەردەکەوێ لەکاتی وردبوونەوە لە چوارینە ڕەسەنەکانی خەییام ( کە لە دیوانی خەییام بە کوردی پاچڤەکراون و بە دەقە فارسییەکان گیراون) و پاشان بە پەیگیریی هاوشێوەکانیان لە چەندین چاپی فارسی و پاچڤەی عەرەبی دیکەی چوارینە کانی خەییامدا.

جا چونکە ئەو لاساییکەرانە جیاواز و هەمەجۆر مەشرەب بوونە ، ئیدی زۆر چوارینەی جۆراوجۆری ئاوەکی و غەوارەیان بەناوی عومەری خەییامەوە لێ کەوتۆتەوەو، هەڵبەتە خەییام لێیان بەرییە ! بگرە هەندێکیان چوارینەی یەگجار بازاڕی و پڕوپووچن . تەنانەت دەسکاری و گۆڕینی ئەم وشە یان ئەو وشە لە گەلێك لە چوارینە ڕەسەنەکانیشدا هەیە ، وەکو گۆڕینی (ایّام) بۆ (خیّام ) لەم چوارینەدا :
" ایّام زمانه از کسی دارد ننگ" و لە چوارینەیەکی تردا فەرمانی داخوازی لە دەستە واژەی ((شادی بطلب = بۆ شادی بگەڕە....'' ڕێك پێچەوانە کراوەتەوە " شادی مطلب = بۆ شادی مەگەڕە..." !

لە پەیڤینی (قفتی)دا دەربارەی خەییام بۆمان بەدیار دەکەوێ ، کە هەندێ لە سۆفییەکان لە کۆنەوە خولیای شرۆڤە و تەئویلی سۆفییانەی هێماکانی چوارینەکانی خەییامیان کەوتۆتە سەر و، لەگینە هەندێ چوارینەشیان بەجۆرێك گۆڕی بێت و

دەستکاری کردبێت، کە دەگـەڵ تەریقـەت و مەشـرەبی خۆیانـدا بگونجێـت و ببێتـە پشتەوانەیان و، قفتی ئەمەی بەدەڤۆکێکی توورەو رقئامێز گوتووە!

## خەییامەکەی باسکاڵ

**پییێر پاسکاڵ** (١٩٠٩- ١٩٩٠) لە ساڵی ١٩٥٨ لـە (رۆمـا) دا کتێبێکـی رازاوەی بـە وێنەو نیگارێن جوان ، بەزمانی فەرەنسی بـەنێوی (چـوارینەکانی عومـەر خـەییام) بڵاوکردەوە . بەڵام پاسکاڵ وەکو ژۆکۆڤسکی و کریستنسـن ودکتـۆر رۆزن خـۆی بـە هاوێرکردنی چوارینە رەسەنەکانی خەییام لە چوارینە ئاوەکییەکان ماندوونەکردووە و، هەوڵێکی ئەوتۆی لەو رووەوە نەداوە، بەڵکو (٤٠٠ چوارینە) ی لە وانەی دراونەتـەپاڵ خەییام پاچڤەکردوون بە پشـتەوانەی نوسـخەکەی کـەمبرێج ، کـە عـەبباس ئیقبـال ئاشتیانی دۆزیویەتیەوەو لە (٦٠٤ك = ١٢٠٧ ز) دا تۆمار کراوە و (٢٥٢ چـوارینە) ی لەخۆگرتوەو، نوسخەکەی چیستەر بیتی کـە لـە ( ٦٨٥ك = ١٢٨٦ ز) دا تۆمـارکراوەو (١٧٢ چـوارینە) ی لـەخۆگرتووە ، هـەروەها سـوودی لـە دوو دەستنووسـی دیکـەی کتیبخانەی نیشـتمانی پـاریس وەرگرتـووە ، کـە یەکـەمیان لـە (٨٥٢ ك = ١٤٤٨ ز) تۆمـارکراوە و (٥٦ چـوارینە) ی لـەخۆگرتووە و، دووەمیـان لـە (٨٧٩ك = ١٤٧٤ ز) تۆمارکراوەو(٢٦٨ چوارینە) ی لەخۆگرتووە .

پەیجۆرانی باوەڕپێکراو نادروستی و قەڵبی هەردوو دەستنووسێن سـاڵانی (٦٠٤ ك = ١٢٠٧ ز) و(٦٨٥ ك = ١٢٨٦ ز) بۆ ساغبۆتەوە، کە ئەو دوو مێژووە هەڵبەستراون ! بگرە گەلێك لەو چوارینانەی ئەو دەستنووسانە بە خۆیان شایەتن بەسەر نادروستی مێژووی تۆمارکردنیانەوە. بەڵام دوو دەستنووسەکەی کتێبخانەی نیشتمانی پاریس، تا ئێسـتا

کەس گومانی لە دروستی و رەسەنایەتی و مێژووی تۆمارکردنیان نەبووە، گەرچی رەسەنایەتی چوارینەکانی ناویان هێشتا جێگەی مشتومڕ و گێنگەشەن .

پاسکاڵ لەپێشەکییە پڕ بەهاکەی و لە شوێنی دیکەی کتێبەکەیدا، رەخنەی لە فیتزجیراڵد گرتووە، چونکە چوارینەکانی خەییامی پاچڤەنەکردووە، بەڵکو شتێکی تری خۆی هۆنیوەتەوە! لە کاتێکا پاسکاڵ (٤٠٠ چوارینە) ی بە ئەمانەتدارییەوە پاچڤە کردووەو هەوڵیداوە مانای دەقە فارسییەکانی زۆر بەوردی و بە کەمترین دەسکارییەوە بۆزمانی فەرەنسی بگوازێتەوە . ئەڵهەقی لەو رووەوە کارو ئەرکی پێویستی جێبەجێکردووە...بەڵام دگەڵ ئەوەشدا هەوڵەکەی ئەویش لە هەوڵەکەی فیتزجیراڵد ، کە رەخنەی لێگرتووە جیاواز نیە، چونکە ژمارەیەکی زۆری لە چوارینانی ئاوەکی و هەڵبەستراو وەرگێڕاوە و، ژمارەیەکی کەمی چوارینەی ئەسڵ ورەسەنی پاچڤەکردووە . جیاوازی نێوان پاچڤەی فیتزجیراڵد و پاسکاڵ ئەوەیە کە هینەکەی پاسکاڵ وردی و روونی و ئەمانەتدارییەکی زۆری تێدایە و، هەندێ روونکردنەوەی بەسوودیشی لەمەڕ هەندێ چوارینە پێشکەشکردووە، جگە لەو ئامارە بیبلیۆگرافیە نیمچە تێروتەسەلەی بۆ دەستنووسە بەناوبانگەکان و وەرگێڕانە گرینگەکانی چوارینەکانی خەییام بۆ زمانە جیاوازەکان و ژمارەی پاچڤەکان لە هەر زمانێکداو ناوی پاچڤەوانەکان و، خشتەیەکی رێکوپێکی بۆ ژێدەرێن هەر (٤٠٠ چوارینە) پاچڤەکراوەکان رێکخستووە، بگرە توانای داهێنەرانەی پاسکاڵ لە دابەشکردنی ناوەڕۆکی چوارینەکانی خەییام بەسەر پشکێن جیاوازدا گرنگترین خەسڵەتی کتێبەکەین :

**(١) بادە :**
بادەی حیکمەت . بادەی ئەڤین . بادەی رۆژانە. بادەی هەنووکە . بادەی مەرگ .
**(٢)** قۆستنەوەی ساتەکانی ژیان .
**(٣) گوێنەدان بەدنیا :** جیهانی ئادەمیانە. رۆژەکانی یەك شەو. ریاکاران. نەمانی هەموو شتێك
**(٤) هەموو شتێك بەرەو نەمانە**
**(٥) ئایا گەڕانەوە بۆ ژیان لەگینە؟**
**(٦) گۆزەسازو گڵی ئادەمیزاد**
**(٧) خوداو ئاسمان (قەدەر) :** بێدەنگی خوداوەند. هەڤدژیێن خودایانە . چاکەو بەدیی قەزاو قەدەر .

گەرچی زۆرینەی ئەم چوارینە پاچڤەکراوانە هی خەییام نین " بەڵام رێکخستنیان بەم جۆرە بەخۆی کارێکی داهێنەرانەیە، چونکە جۆری هزرو تێهزرینی ژمارەیەك لە هزرڤانانی ئێرانی پێشکەشی خوێنەران دەکات، ئەمەش خۆی لە خۆیدا کارێکی بەهادارە، تەنانەت ئەگەر کتێبەکەش دەربارەی خەییام نەبێ، هەر خەییامی تێدایە میناك هەبوونی لە وەرگێڕانەکەی فیتزجیراڵدا " بەگوزارشتی مامۆستا دەشتی، کە لە ئەنجامدا بەم جۆرە کتێبەکەی پاسکاڵ هەڵدەسەنگێنێ : " ئەم کتێبەی پییێر پاسکاڵ ، سەرنجە زیرەکانەکەی کریستنسن دێنێتەوەیاد، کە بریتییە لەوەی ئەگەر ئەم هەموو چوارینە هەڤدژە ناڤەڕۆك جیاوازانە هی خەییامیش نەبن، بەلانی کەمەوە دەکەنە نمایندەی تێهزرینی ئێرانی و، تێکۆشانی ئاوەزی ئازادیخوازی ئاری لەپێناو دەربازبوون لە یەخسیرایەتی بیروباوەڕی سامییانە"

## (فغ = فرووغی– غەنی) و کۆچوارینەیەکی باش

رەنگە باشترین کۆچوارینانی باوەڕپێکراو، لە نێو کۆچوارینە ساغکراوەکانی خەییامدا سیان بن ، یەکەمیان کۆچوارینە هاوبەشەکەی توێژەرانی شارەزا محەممەد عەلی فرووغی (؟١٨٧٧- ؟ ١٩٤٣) و دکتۆر قاسم غەنی (١٨٩٣- ١٩٥٢) و دووەمیان ساغکردنەوەی (تەرەبخانە) ی یار ئەحمەد رەشیدی لەلایەن جەلالەددین هومایی و سێیەمیان کۆچوارینەکەی پەیجۆری ناودار عەلی دەشتی یە .

مامۆستایان فرووغی و غەنی **(فغ)** ئەم میتۆدەیان گرتۆتەبەر : دەستکردن بەکۆکردنەوەو لەبێژنگدانی ئەو چوارینانەی ، کە لە کۆنترین سەرچاوەکانی نزیك لە رۆژگار و سەردەمی خەییامدا هەن و، بەراوردیان دەگەڵ ئەوانەدا کە لە سەرچاوە باوەڕپێکراوەکانی پاشتردا دووبارە بوونەتەوە. پاشان کەوتوونەتە توێژینەوەو تاوتوێکردن و شیکردنەوەیان لە هەردوك ئاستی ئەدەبی و هزرییەوە بەگوێرەی ئەو نیشانەو بەڵگانەی لەبەر دەستدا بوون ، تا قایلبوونە بەپێی شێواز و هزری هەر چوارینەیەك ، کە لەگەڵ ئاستی رۆشنبیریی بەرفراوانی خەییام دا بگونجێت ، ئەوجا داویانەتەپاڵ خەییام و، دەرەنجام لەسەر (٦٦ چوارینە) گیرساونەتەوە ، کە گوایە بەدڵنیاییەوە هی خەییامن و، پێوەریشیان بۆ ئەم بڕیارە زمان وشێوازی ئەدەبی و وێنە شیعری و ناوەڕۆکی هزریانەی چوارینەکان بووە ، کە لەگەڵ کەسایەتی و رۆشنبیریی و هزرۆکە پەراگەندەکانی ناو کارە زانستی و فەلسەفییەکانی خەییامدا گونجاون و، ئەم (٦٦ چوارینە) یە بەپێی شیکردنەوەو هەڵسەنگاندنی فرووغی و غەنی : " زۆر ساناو سادەو بێ ئارایشتن و لە رواڵەتبازی دوورن ، بگرە لە خەیاڵی شیعریش بێبەشن ، تەنانەت دەتوانین بڵێین کە جگە لە کێش و سەروا چیتریان لە هونەری شیعرا تێیانا نییە ، بەڵام ئەوپەڕی

زمان پاراوی و رەوانبێژیّ تێیانا هەیە و، دروست و کورت و مکوومن ، هـەموو واژەکانیان قالّبن بۆ مانا، کەم و زیادیان تێدا نییە و، هیچ عـەیب و خەوشـێك. زۆر روونە کە بێژەریان مەبەستی واژەبازی و پاراوبازی نەبووە و، هـەموویان بـە دەربڕینی ماناوە بەندن . ماناکانیش بە نازکی و وردی و نایابییان بەسەر گشـت خەیالّبازی و خۆدەرخستنێکدا زالّن ، زۆر جیـددی و بـیّ گالّتـەبازین (....) و، ناوەڕۆکێن چوارینەکان هەموو بەرهەمی خووی دانایەکی هزرڤانی دوور ڕوانە..."

ئەوجا لەبەر رۆشنایی ئەم پێوەرە کەوتوونەتە هەلّبژاردنی چوارینانی تـر ، تـا (١١٢ چوارینە) ی تریان دۆزییەتەوە ، کە ئەگەری ئەوەیان هەیە هی خەییام بن و، بەو جۆرە کۆی چوارینەکانیان گەییە (١٧٨ چوارینە) و، بۆ یەکەم جار لە سالّی (١٩٤١) دا چـاپ وبلاّو ویان کردەوە ، بەلاّم دانیـان بەوەشـدا نـاوە کـە چـوارینە زیادکراوەکانیـان پـتر بەگوێرەی چێژی ئەدەبی خۆیان هەلّبژاردووە تا بەگوێرەی هەبوونی بەلّگەی بنجـبڕ و، هەر چوارینەیەکی ئامۆژگاریئامێز ، یا سۆفییانە ، یا عیرفـانی ، یـا دلّـداری ، یـا ئایینی ستایشی ، یان موناجاتی ، یان بیدعەتئامێزی ، یان بادەنۆشی پـەتی ، یـان سواو بازاڕی و بەتالّ لە هەر رەهەندێکی هـزری و فەلسـەفی ، یـان شـاش لـە رووی شێوەو ناوەڕۆکەوە ، یان سۆزداری چ دەگەلّ خەییام و چ دژی خەییام ، یان بیّ نمـوودو ئاست بووبێت ، یان لە چوارچێوەی حیکایـەتێکی ئەفسـانەیی دەسـتکردا بووبێـت ، لایان بردوون ، میناك ئەم چوارینانە :

**" ابريق مى مرا شكستى ربى**

**= مەسینەی مەیی منت شکاند خوایە"**

کە روخساری خەییام پاش وتنی رووی رەشهەلّگەڕاوە و، یەکسەر چـوارینەیەکی تـری وتووە:

**" ناکرده گناه در جهان کیست بگو؟...**

**- نەکردە گوناه لەم جیهانە کێیە بڵێ ؟**

ئینجا یەکسەر رەشیی روخساری لاچووە!

ئەم چوارینەش کە خەییام وەڵامی دایکی لە خەوندا داوەتەوە، چونکە زۆر لـە خـودا پاڕاوەتەوە لە گوناهەکانی ببوورێت :

**" ای سوخته سوخته سوختەنی..."**

**- ئەی سووتاو سووتاوی سووتماك !**

ئەمانەی داهاتووش چەندین نموونەی دیکەن لەو چوارینە ئاوەکییە دوورخراوانـە لـە لایەن هەردوك شاسوارێن مەیدانی خەییامناسی (فغ) :

× " تا بتوانی خدمت رندان میکن "

= چەند دەتوانی راژەی رەندان بکە

× " از من بر مصطفی رسانید سلام"

= لە منەوە بۆ مستەفا سەڵاو بگەیەنە

× " از من بر خیام رسانید سلام"

= لە منەوە بۆ خەییام سەڵاو بگەیەنە

× " برخیز و بده باده چه جای سخن است"

= هەستەو بادەمان بدەرێ چ کاتی قسەیە؟

× " ای بادەی ناب و ای می مینائی"

= ئەی بادەی نایاب و ئەی مەیی روون

× " ای عارض تو نهاده بر نسرین ترح"

= ئەی رووومەتی تۆ کە رووی نەسرینی پۆشیوە

× " عشقی مجازی بود آبش نبود"

= عیشقێك مەجازی بێت وشکوبرینگە

× " پندی دهمت ماه رمضان برفت و شوال آمد"

= ئامۆژگاریت دەکەم مانگی رەمەزان چوو، شەووال هات

× " گر گوهر طاعتت نسفتم هرگز.."

= گەر گەوهەری تاعەتی تۆم هەرگیز کون نەکردووە

**(ئەم چوارینە پاشینەیە موناجاتییە و، زۆربەی توێژەران داویانەتەپاڵ ئەبووخەیر/ج.ز)**

دەرەنجام مامۆستایان فرووغی و غەنی بەڕاشکاوی دانپیادەنێن و ئێژن :

" لە پایانی پەیڤیندا، دەبێ بەڕاشکاوی بڵێین، لاڤی ئەوە لێنادەین کە ئەم چوارینانەی وا هەڵمانبژاردوون و بەناوی خەییامەوە لە قەڵەممان داوون هی خەییامن بە شێوەی بنجبڕ و یەقین ، یاخود ئەمانە هەموو چوارینەکانی خەییامن ، بەڵکو لە روانگەمانەوە لە رەگەزی پەیڤینی حەکیمی نیشابوورە و، لەوەیە لە پەیڤینی ئەو بن و شایستەی بێت ، کەچی دادوەری راستەقینە لەم هەڵبژاردنەدا چێژو سەلیقەمان بووە، نەك بە حوججەت و بەڵگە...."

بەڵێ کارەکەی فرووغی و غەنی دواکاری بنجبڕ نیە ، چونکە هەندێ چاڤکانییان نەدیبوو مینا (روضة الناظر = گوڵستانی بینەر) ی عەزیزی کاشی (سەرەتای سەدەی ٨ کۆچی= ١٤ ز) کە (٤ چوارینە) دراوەپاڵی خەییامی تێدایە . بۆ سەلماندنیش ، دەبوایە هەموو ژێدەرێن (١١٢ چوارینە) زیادەکراوەکان وەکو ژێدەرێن (٦٦ چوارینە) رەسەنەکە دیاری بکەن ، تا باسکارانی دی بیان توانیبا پەیجۆریی باسەکە بکەن و، بیاندەن لە بێژنگ و رەسەنایەتیی و نارەسەنایەتی ئەو چوارینانە ساغبکەنەوە ، بگرە بەڕاستیش هێشتا گومان لە (١٠ چوارینە) لەو (٦٦ چوارینە) یە هەیە کە هی خەییام بن (ئەمەم بەدرێژی لە دەهمەن و پەراوێزی پاچڤەکانیاندا روون کردۆتەوە) هەروەها

(١٥ چوارینه له ١١٢ چوارینه زیادکراوەکاندا) جێی گومانن ، چونکه هەندێکیان دراونەتەپاڵ شاعیرانی دیکه و، هەروەها هەندێکی تریان دراونەتەوەپاڵ خاوەنە راستەقینەکانی خۆیان (ئەگەرچی هەندێ جار سووکە جیاوازیان تێدا هەیە) ئەمەش هەندێ روونکردنەوەی پێویستە لەم بوارەدا:

×" گویند : بهشت و حور عین خواهدبود"/

**عەینولقوزاتی هەمەدانی و، مەولانا جەلالەددین روومی**

× " گویند : مرا که دوزخی باشد مست"/

**بە سووکە جیاوازییەکەوە دراوەتەپاڵ ئەمیر ئەحمەد گەنجەوی :**

" گویند : بهشت را کجا یابد مست"

× " گر آمدنم بەخود بدی، نامدی " / **سەنائی غەزنەوی**

× " هرگز دل من ز علم محروم نشد"/ **ئیمام فەخری رازی**

× " بر بستر خاك خفتگان می بینم "/ **عەتتاری نیشابووری**

× " این اهل قبور خاك گشتند و بخار"/ **عەتتاری نیشابووری**

× " از تن چو برفت جان پاك من وتو"/ **بابا ئەفزەڵ کاشانی**

× "گویند کسان : بهشت با حور خوش است"/

**بە سووکە جیاوازییەکەوە دراوەتەپاڵ عەینولقوزاتی هەمەدانی :**

" گویند : بهشت و عدن با حور خوش است"

× " گویند : بهشت و حور و کوثر باشد"/ **عەینولقوزاتی هەمەدانی**

× " از آمدن و رفتن ما سودی کو؟"/ **بابا ئەفزەڵ کاشانی**

× " در دایرەء سپهر ناپیدا غور"/ **بابا ئەفزەڵ کاشانی**

× " نیکی و بدی که در نهاد بشراست"/ **ئەوحەدەددین کرمانی** (م : ١٢٩٨ ز)

× " یك قطره آب بود و با دریا شد"/ **عەتتاری نیشابووری**

× " ز ان می كه حيات جاويدانی است بخور"/ **بابا ئەفزەڵ كاشانی**

× " ابر آمد و بر سر سبزه گريست "/ **فەخرەددين عيراقی** (م : ؟ ١٢٨١ يا ١٢٨٩)

× " قرآن مهين كلام خوانند آنرا "/ **سيراجەددين قومری**

له پشكنين و ساغكردنەوەو پاچڤەيەمدا دەورووبەری (٦٠ چوارينه) له كۆچـوارينەی (فغ) ــم به هەند وەرنەگرت و، بەهی خەييامم نەژمارد.

له بنەتای ئەم بابەتەدا پێويستـته بڵـێم كـه بەنـده لێـرەو لـه پـەراوێزێن پاچـڤەی چوارينەكان لەسەر ناوهێنانی دكتۆر قاسم غەنی زۆر جەختمكردووەو، وتەنانەت ناويم لەگەڵ فرووغيدا به (فغ) داناوه وئاماژەم پێی كردووه ، كەچـی هـەموو باسـكاران و پاچڤەوانان تەنيا ناوی فرووغی دێنن و رۆڵ و مافی (دكتـۆر قاسـم غـەنی) پشـتگوێ دەخەن !

# جەلالەددينی هومايی و لێكۆڵينەوەيەكی قووڵ و فراوان

جەلالەددينی هومايی (١٨٩٩- ١٩٨٠) كەڵە پەيجۆرو وێژەڤانی گەورەی ئێرانی (**كوردی فەيلييه وله عەشيرەتی زەنده**) باشترين ساغكەرەوەی گەورەترين كۆچوارينەی خەييامـه، كه يار ئەحمەد رەشيدی تەبريزی لەژێر سەرناڤی (تەرەبخانه = بەزمخانه = كەيفخانه) له ساڵی (٨٦٧ ك = ١٤٦٢ ز) كۆيكردۆتەوه و رێكيخستووه.

هومايی كەڵەخەييامناس زۆر بـه فراوانـی و وردیـی لـه (كەيفخانـه) و خـەييام و چوارينەكانی كۆڵيوەتەوه و، لەگەڵ بەرجەستەترين دەسـنووس و كارەكـانی پێشـتريدا تاوتوێی كردووه و رەخنەی بنيادسازی لێيان گرتووه چ له پێشەكييه تێروتەسەلەكەی، چ له پەراوێزه وردەكانيدا وەك : كۆچوارينەكەی فروغی و غەنی و چاپەكەی ئاربری و دەسنووسەكەی بودلييانی ئۆكسـفۆرد و سـاغكردنەوەكەی عەبـدولباقی گولپينـارلی

(١٨٩٩- ١٩٨٢) كە لە ساڵی (١٩٥٣ ز) دا بڵاویکردۆتەوە...ئینجا توانیویەتی (**٥٥٩** **چوارینە**) کەی (تەرەبخانە = کەیفخانە) لە زۆربەی چوارینە نارەسەنەکانی خەییام بژاربکات ، کە پتر لە (١٠٠ چوارینە) یان دەدرێنەپاڵ (**٧٧** هۆزانڤانێن) دیکەی ناسراوو (**٢٤** هۆزانڤانی نادیار، لەوانە : عەتتار، بابا ئەفزەڵ ، فەخرەددینی عیراقی ، کەماڵەددینی ئیسماعیل و سەنائی...و پاشان هومایی (**٨٦** چوارینە) ی دیکەی لە چاڤکانی و ژێدەرانی دێرین دەرهێناوە و خستوونیەتی سەر(**٥٥٩** چوارینە) کەی (تەرەبخانە) و کۆیان گەیشتۆتە (**٦٤٥** چوارینە) و دەڵێ - بەپێی پاچڤەی مامۆستا سەلاحەددین ئاشتی- " ئەوانەش بە ناوی خەییامەوە نووسراونەوە، کەچی زۆربەشیان لە هی وی ناچن ، بەڵام گوتم با ون نەبن و تێدا نەچن، بەڵکوو رۆژێك خاوەنیان بۆ پەیدا بوو..."

هومایی رەشیدی تەبریزی بە **(دارکەری شەو)** لە کۆکردنەوەی چوارینە و حەکایەتەکانی (تەرەبخانە) دا وەسفدەکا و، بەڵام لە هەمان کاتدا پێی وایە کە تەرەبخانە = کەیفخانە) لە نوسخە دەسنووسەکەی (بودلییان کە ١٥٨ چوارینەی تێدایە) باشترە ، چونکە دەوروبەری (٢٠٠ چوارینە) یەکی رەسەن و رەسەنئاسای خەییامی تێدایە ، کەچی چواریەکی ئەو ژمارەیە لەوەی (بودلییان) دا نیە .

بە چوونگەی هومایی چوارینەکانی خەییام لە (**تەرەبخانە**) دا بە سێ گرووپ پۆلێندەکرێن :

(١) **چوارینە رەسەنەکان :** کە لە چاڤکانی و ژێدەرکانی پێش سەدەی نۆیەمی کۆچی تۆمارکراون و، گەورەترین ژمارەیان لە (تەرەبخانە) دا تۆمارکراونەتەوە.

(٢) **چوارینە تێخزاوەکان (دەخیلەکان) :** کە هی هۆزانڤانێن تر و بە هەڵە دراونەتەپاڵ خەییام ، کە پێشتر ژۆکۆڤسکی (٨٢ چوارینە) یانی

دەسنیشــانکردووە و کریستنســن ژمارەکــەی گەیاندۆتــە (١٠٠) و گولپینــارلی (٤٥ چوارینە) ی دەسنیشانکردووە و، هۆزانڤانیێـــــن خـــــودانی ئەو چوارینانە ئەمانــە و هۆزانڤانیێن ترن : عەبدوڵلا ئەنصـاری (م : ١٠٨٨ ز)، ئــەبوو ســەعید ئەبوولخــەیر (م : ١٠٤٩ ز) ، ئــیبن ســینا، ئیمــام فــەخری رازی (١١٤٩- ١٢٠٩) ، ســەنائی غەزنــەوی ، عەتتاری نیشــابووری ، کەمالــەددین ئیســماعیل (م : ١٢٣٧)، ئــەنوەری (؟ ١١٢٦-؟ ١١٦٩)، مەولانا جەلالەددین ، نەجمەددین کوبرا (م : ١٢٢١)، بابـا ئــەفزەڵ کاشــانی ، نەصیرەددین تووسی ، ئەوحــەدەددین کرمــانی (م : ١٢٩٨)، عوبێــد زاکــانی (١٣٠٠- ١٣٧١)، حــافزی شــیرازی ، مەجــدەددین هــەمگر (م : ١٢٧٩)، جەمالــەددین ســەلمان ســاوجی (١٣٠٠- ١٣٧٦)، شـــێخ رووزبــەهان شــیرازی (١١٢٨- ١٢٠٩)، ســیراجەددین قومری (م : ١٢٢٧ یا ١٢٤٢)، هیممەتی بەلخی (؟!)، ســەیفەددین باخــەرزی (م : ١٢٣١ ز)، شەمس مەغربی (نیمەی سەدەی ٦- سەرەتاکانی سەدەی٧ ك= ١٢- ١٣ ز)، شاه نیعمەتوڵلا وەلی (؟ ١٣٢٩- ١٤٣٠)، شێخ ئەبولحەســەن خــەرقانی (٩٦٣- ١٠٣٣)، شــاه سنجان خەوافی (م : ؟ دەوروبەری ١١٩٦- ١٢٠٢) و تالب ئــامولی (م : ١٦٢٦)...بــەلام هومایی لە هەمان گاڤدا پرسیارەکەی فرووغی و غەنی دووبارە دەکاتەوە : " لە کویّ و چۆن بــزانین کــە گــەلێك لــە چــوارینە رەســەنەکانی خــەییام نەخزاونەتــە دیــوانێن هۆزانڤانانی دیکەوە؟ !"

(٣) **چوارینە گومانبارەکان :** دەیان چوارینەن کە لە چوارینە رەسەنەکانی خەییام دەچن و هاوهزرو هاوشێوەیانن، بەلام هیچ بەڵگەیەکی بنــبڕ نیــە بــۆ ســەلماندنی درانــەپاڵی خەییام، یان نەدرانەپاڵی خەییام، بۆیەش بەڕای هومایی دەبیّ بدرینە پاڵ خەییام، تــا بەڵگەی پێچەوانە دەرکەڤیّ و، ژمارەیان لە (تەرەبخانە) دا زۆرە وەك :

× آن قــصــر کە بر چرخ فلك همی زد پهلو

× این کوزه چو من عاشق زاری بوده‌است

× گـاویـســـت در آســـــمان و نامــش پروین

به ڕای بەندە دەبوایە پەیجۆری مەزن هومایی ناوی گرووپی چوارەمینیشـی بنایـە ، کە بەکردەوە دەسنیشان و باسیانی کرددوە، کە سەدان چوارینەی پڕوپووچن لـە ڕووی هزرییەوە و، فریان بـە کەسـایەتی زانسـتی و فەلسـەفی خەییامـەوە نیـە و، زۆریـان کوفرئامێزو مەیگوساری و ئیرۆتیکی بێ ئاستن ، **واتە {(٤) چوارینە پڕوپووچـەکان}** هومایی (تەرەبخانە) ی لە ساڵی (١٩٦٣) دا بڵاوکردۆتەوە و، بەندە سوودێکی زۆرو فرە باشم لێی وەرگرتووە بۆ ساغکردنەوی (دیوانی خەییام ، چ بە عەرەبی و چ بە کوردی) و لە لاپەڕەکانی پاش و پێشووشدا زۆر پەنام بۆی بردووە.

## عەلی دەشتی و تۆژینەوەیەکی قووڵ و کۆچوارینەیەکی پوختە

پەیجۆری گەورەی ئێرانی عەلی دەشتی (١٨٩٥- ١٩٨١) لە کتێبە بەهادارەکەی (دمی با خیام = تاوێك لەگەڵ خەییام ) دا کـە لـە لاپـەڕەکانی پێشـتر زۆر نـاوی هـاتووە تۆژینەوەیەکی بـاش و کۆچـوارینەیەکی باشـی خـەییامی پێشـکەش کـردووە ، کـە خەییامناسی عەرەبی ناڤدار دکتۆر یووسف بەککار بەم جۆرە هەڵیسەنگاندووە :

" باشترین دانراوی زانستییە کـە خـۆی لـە خـەییام و چـوارینەکانی داوە ، چـونکە خاوەنەکەی بەگوێرەی ڕێبازێکی وردی زانستیی بەجیددی لـە سـیما ڕاسـتەقینەکانی خەییام گەڕاوە و هەوڵیداوە چوارینە ئەسڵییەکانی خەییام دەسنیشان بکات ، چـونکە زۆر شت لەمەڕ خەییام گوتراوە و زۆر تورەهات و ئەفسانانی بەگەڵ خـراوە و، هێنـدە چوارینەیان دراوەتەپاڵ بەرادەیەك چوارینە ئەسڵییەکانی- کە بە مەزەندە زۆر کەمن - پۆشیوە و خستۆتە تاریکی ، بۆیە جیاکردنەوەو دەرهێنانی چوارینە ڕەسەنەکان لـەناو

ئەو هەموو چوارینانەی دراونەتەپاڵ خەییام کێشـەیەکی سـەخت و کـارێکی یـەگجار دژوارە و، پێویستی بە زۆر قەواڵـەی مێـژوویی و بەڵگـەی زانسـتی و هاوسـەنگی و هەڵسەنگاندنی ئەدەبی هەیە و، قوڵبوونەوەی وردی بۆ شۆڕبوونەوە بۆ قووڵایی رووحی رۆژگارو سەردەمەکەی شاعیر"

چاپی یەکەمی (تاوێك لەگەڵ خەییام) دا لـە (١٣٦٤ ش = ١٩٨٥ ز) دا بڵاوبۆتـەوە و، چاپی دووەمی کە لەژێر دەستمایە (٣٧٩ لاپەڕەیـە) و لـە سـاڵی (١٣٧٧ش = ١٩٩٨ ز) بڵاوبۆتەوە . لێرەدا مەبەستم لێدووان لەم شاکارە سـخ و چـڕە نیـە ، مەگـەر بـەپێی پێویست ، نەمازە لە بواری دەسنیشانکردنی گەلێ لە چوارینە رەسەنەکانی خەییام ، کە مامۆستا دەشتی بەوپەڕی وردی لێیان کۆڵیوەتەوە و، (٣٦ چوارینە) ی وازکەری بە دڵنیاییەوە لە چاڤکانی و ژێدەرە دێرینەکان هەڵبژادووە : (نامەی ئاگادارکردنەوە...) و (چاودێرگەی عیبـاد...) و(مـونس الاحـرار) و (نوزهـەتو لمـەجالس) و (گەمیـەی شوورا) و(جەمسەرە جەمسەرییەکان)...ئینجا (٣٨ چوارینە) ی تری خستۆتە سەریان و، کۆ چوارینە رەسەنەکانی خەییامی لەلا بۆتە (٧٤ چوارینە) و پاشان (٢٦ چـوارینە) ی دیکەی بە (رباعی خیام وار= چوارینەی زڕەخەییامی) لە قەڵەم داوە .

دەبێ ئەوەش بڵێم کە مامۆستا دەشتی دەیانی لەو چوارینانە پاشگوێ خستووە کـە خەییامناسانی پێشترو پاشتر بە رەسەنیان زانیوەو داویانەتەپاڵ خەییام ، مەبەستیشم هەر ئەو چـوارینانە نیـە کـە نـاوەڕۆکی دووبارەکراوەیـان تێدایـە ، کـە دەشـتی بـە لاسایکراوەی چوارینە رەسەنەکانی خەییامی ژماردووە و، چوونگەکەی راستە .

بەندە لە کتێبی (دیوان عمر الخیّام) دا سـاغکردنەوەکەی (دکتـۆر رەحـیم رەزازادە مەلیك) م کردبووە رێڤگـە و رێنـوێن ، کەچـی لـە ( دیـوانی خـەییام بـە کـوردی) ساغکردنەوەکەی مامۆستا (دەشتی) م کردۆتە رێڤگە و رێنوێن ، لە هەمان کاتیشـا

پەنام بۆ هەر سەرچاوە و ساغکردنەوەیەکی باشـی دیکـە بـردووە ، هەڵبەتـە بـەپێی قەناعەتی خۆم .

## فەرزانەو چوارینە راستەقینەکانی خەییام

توێژەری بەتوانا موحسن فەرزانە بەزەبری هەوڵە بەرچاوەکەی لەنێوان چەندین باسکاری دیکەی فرەشارەزا لە خەییامناسیدا رایگرتم ، لەوانـە : جەلالـەددین هومایی ، رەشید یاسمی ، ئەصغەر بەرزی ، مەهدی فولادوەند و محەممەد تـەقی جەعفەری و چەندین باسکاری تر، بۆیە حەزمکرد وەکو نموونە کورتەیەکی چڕو پوختەی هەوڵەکەی ئەو لەم بەرو ماوە تەنگەدا پێشکەش بکەم ، چونکە باسی هەوڵوکۆششی هەموویان پانتاییەکی فراوانی پێویستە .

فەرزانەی پەیجۆر پێی وایە ژمارەی چوارینە رەسەنەکانی خەییام لە (٥٤ چوارینە) کەمتر نین و، دەڵێت نیشابوورییەکانی سەدەکانی (٥ و٦ ك = ١١ و١٢ ز) خەییامیان میناك زانا و فەیلەسووفێکی ناودار دەناسی ، بەڵام نەك وەکو شاعیر، تاکو هەندێ مێژوونووس و هزرڤان و نووسەر پاش نزیکەی نیوسەدەیەك لە مردنی و پێهەل... ئاماژەیان بۆ خەییامی شاعیر کردووە و نموونەیان لە شیعرەکانی لە کتێب و بەرهەمەکانیاندا تۆمارکردووە ، کە باسکار رەحیم رەزا زادە لە پێشتردا ناوی تۆمارکردوون .

بەگوێرەی بۆچوونی فەرزانەی باسکار، پرۆژەی ناساندنی خەییام وەکو شـاعیر چـەند سەدەیەکی بـەقۆناغ خایانـدووە ، هەڵبەتـە خـەییام بەخۆیشـی بەچـەند قۆنـاغێکی شیعریدا تێپەڕیوە ، کە پەیوەندیان بە قۆناغـەکانی تەمـەنی و پەرەسـەندنی ئاسـتی زانستی و فەلسەفی خۆیەوە هەبووە .

ئەمەش کرۆنۆلۆجیای دەرکەوتن و بڵاوبوونەوەی چـوارینەکانی خەییامــە بــە پێــی بۆچوونی فەرزانە :

(١) **(٤٦٧- ٦١٧ ك = ١٠٧٤- ١٢٢٠ ز) واتە تا هێرشی وێرانکەری مەغۆلەکان :** یەکەم کەس کە چەند چوارینەیەکی خەییامی تۆمار کردووە زەهیری سەمەرقەندیە لە کتێبی (سیندەباد نامە) دا، کە (٥ چوارینەیە و، یەکێکیان شێوێنراوە یان دەسـکاری کـراوە !) بەڵام بەبێ ئـەوەی نـاوی خـەییام بهێنێـت. پاشـان **راوەنـدی** مێـژوونووس تـەنیا چوارینەیەکی لە کتێبی (راحة الصدور) دا (٥٩٩ ك = ١٢٠٢ ز) تۆمـارکردووە. ئـەوجا ئیمام فەخری رازی (١١٤٩- ١٢٠٩ ز) دوو چوارینەی بە ناوی خەییامەوە تۆمارکردووە. ئەوجا ئەم چوارینەیەی بەنیوە دێڕی : " آرند یکی و دیگری بربایند" دەسپێدەکات لە یــەکێك لــە دەستنووســەکانی (ســەوانیح) ی شــێخ ئەحمــەد غــەززالی (م : ١١٣٢ ز) نووسراوە . ئەم دەستنووسە لە (١٠١٦ ك = ١٦٠٧ ز) لــە ئەحمــەد ئابــادی - گـوجرات تۆمار کراوە و، لە کتێبخانەی مەلیك پارێزراوە .

کەواتە تا سەردەمی هێرشی مەغۆلەکان تــەنیا (هەشـت چـوارینەی خـەییام) مــان دەسکەوتووە ! هەڵبەتە بەم چوارینەیەشەوە کە بەم نیوە بەیتە دەسپێدەکات :

" در پشت من از زمانه تو می اید" کە لە (مەرزبان نامــە) دا بــە بــێ ناوهێنــانی خەییام هاتووە و، دانــانی ئــەم کتێبــە بـۆ ســاڵانی (٦٠٧- ٦٢٢ ك = ١٢١٠- ١٢٢٥ ز) دەگەڕێتەوە ، واتە بـۆ ئــەو ســەردەمەی کــە مێژوونووســان و نووســەران لــە ترسـی واعیزانی سوڵتانان خۆیان لە نێوهانینی خەییام دووردەگرت .

(٢) **(٦١٧ ك ، تاکۆتایی سەدەی هەشتەمی ك = ١٤ ز) :** لەم قۆناغــە مێژوویيــەدا و بەتایبەتی لە مردنی تەیمورلەنگەوە تا سەردەمی شا عەبباســی صــەفەوی (١٥٧١-

١٦٢٩) ، جۆريك له ئازادی و كرانەوەی هزری رەخسا، بۆیە چوارینەکانی خـەییام بـەم شێوەیە کەوتنە دەرکەوتن :

× (٦٢٠ك = ١٢٢٣ ز) : **دوو** چوارینە لە (مرصاد العباد)ی شێخ نەجمەددین رازی (م:١٢٤٧).

× (٦٣٠ ك = ١٢٣٢ ز) : **٣٣** چـوارینە- دووانیـان دووبـارەکراوەن- لـە (نزهـە المجالس)ی شێروانی

× (٦٥٨ ك = ١٢٥٨ ز) : **یەك** چوارینە لە (تاریخ جهانگشای) ی جـوەینی (١٢٢٦-١٢٨٣)

× (٧٢٠ ك = ١٣٢٠ ز) : **یەك** چوارینە لە (تاریخ نامە هرات) ی سەیفی هـورەوی (ل:١٢٨٢)

× (٧٣٠ ك = ١٣٢٩ ز) : **یەك** چوارینە لە (تاریخ گزیدە) ی حەمەدوڵڵا مسـتەوفی (م: ١٣٤٩ ز)

× (٧٤٠ ك = ١٣٣٩ ز) : **دوو** چـوارینە لـە (ئـەخلاقو لئەشـراف) ی زاكـانی (١٣٠٠-١٣٧١ ز)

× (٧٤١ ك = ١٣٤٠ ز) : **١٣** چـوارینە لـە (مـونس الاحـرار..) ی محەممـەد بـەدر جاجەرمی

× (ناڤینی سەدەی هەشتی کۆچی = ناوەڕاستی سەدەی ١٤ ز) : **١٥** چـوارینە لـە دوو دەستنووسدا، کە ئێستا لـە (کتێبخانـەی ئەنجومـەن) دا لـەتاران پـارێزراون ، و گومان لە رەسەنایەتی (٦ چوارینە) یان هەیە .

شایەنی باسە کە هەندێ لە شاعیرانی ئەو سەردەمە ، بایەخیان بەشـیعری خـەییام داوەو بەچاولێکەری ئەو چوارینەکانی خۆیـان هۆنیوەتـەوە ، دیارترینیـان ئەمانـەن :

هەردوك شاعیری بەنێوبانگ حافزی شـیرازی (؟ ١٣١٧- ؟ ١٣٩٧ ز) و ئـیبن یـەمین (؟ ١٣٦٧- ؟ ١٤٥٠ ز) و پێش ئەوانیش سەعدی شیرازی (؟ ١٢١٣-؟ ١٢٩٥ ز).

(٣) **(سەدەی نۆیەمی کۆچی= ١٥ ز)** : وادیارە لە سەرەتاکانی سەدەی حەوتەمی کۆچی یـەوە (١٣ ز) بایـەخی زیـاتر بەچـوارینە فەلسـەفییەکانی خـەییام دراوە و، ئیـدی بایەخدانی خەڵکی بە خـاس و عامـەوە ، بەچـوارینەکانی خـەییام بەڕادەیـەك رووی لـەزیادی کـردووە ، کـە یـار ئەحمـەد رەشـیدی تـەبریزی کەتۆتـە کۆکردنـەوە و، پۆلینبەندییان لەکتێبێکدا بەناو نیشانی (تەرەبخانە) کە لە سـاڵی (٨٦٧ ك = ١٤٦٢ ز) دایناوە ، بەڵام ئەفسووس زۆر چوارینەی شـاعیرانی دی بەهەڵـە تێئـاخنیوە ، وەك : ئەبوو سەعید ئەبوولخەیر، شێخ عەبدوڵڵا ئەنصاری ، ئەبوو حەسەن خەرقانی ، ئیمـام محەممەد غەززالی ، سەنائی غەزنەوی ، عەتتاری نیشابووری و چەند عارفێکی تر.

وادیارە گوێزانەوەو دزینی چوارینان لە دیـوانی ئـەم شـاعیرەوە بـۆ شـاعیرانی تـر، تاوەکو پاش هێرشی مەغۆلەکانیش هەر بەردەوام بـووە ، بۆیـە چـوارینەیەکی زۆری شاعیران : ئەفزەڵەددینی کاشانی، نەصیرەددینی تووسی ، عوبێدی زاکـانی ، حـافزی شیرازی ، ئیبن یەمین ، تەنانەت ژمارەیەك لە چوارینانی سواویش ، لەگـەڵ چـوارینە رەسەنەکانی خەییامدا تێکەڵبوونـە . وێـڕای هـەموو ئەمـەش هەوڵەکـەی رەشـیدی تەبریزی هەوڵێکی ئەرێنی بووە و، بۆ هەموو ئەوانەی دووای خۆی سوودبەخش بووە .

دروست تر ئەوەیە کە قۆنـاغی سـێیەم بکرێتـە دوو قۆنـاغ ، یەکـەمیان (سـەدەی نۆیەمی کۆچی = ١٥ ز) و دووەمیان سەرەتای سـەدەی دەیـەمی کۆچـی و دواتـرە و، دەقاودەق لـە (٩٠٥ ك = ١٤٩٩ ز) دەسـپێدبکات ، واتـە لـە سـەرەتای سـەرهەڵدانی سەفەوی یەوە و، دامرکانەوەی بایەخدان بەفەلسەفە و بەرهـەمێن حـەکیمانێکی وەك رازی و خەییامە ، گەرچی لە (سەدەی ١١ ك = ١٧ ز) لە (دبسـتان المـذاهب ) دا لـە

هند چوارینەیەکی خەییام دۆزراوەتەوە ، بەڵام ئەمە حاڵەتێکی ریزپەڕی دەگمەنە . لەدوای ئەم سەدەیەوە ئیدی نووسینەوە و کۆپی کۆچوارینانی خەییام لە هندستاندا رەواجی پەیداکردوو پەرەیسەند، بگرە لە سەدەی نۆزدەی زایینییەوە چاپی سەنگی چوارینەکانی لەهندو ئێراندا بووە بە باو .

هەردوك پەیجۆری شارەزا، قەزوینی و فرووغی پێیان وایە دیاریکردنی ژمارەی چوارینە رەسەنەکانی خەییام مەحاڵە، مەگەر دەستنووسێکی پێش هێرشی مەغۆلان بدۆزرێتەو ە، بەڵام ئەمە بەو مانایە نیە ، کە هیچ ئومێدێك نەمێنێت بۆ دۆزینەوەی گەلێك لە چوارینە رەسەنەکانی خەییام لێرەو لەوێ ، لە دیوانەکانی شاعیرانی هاوچەرخی خەییام و دوای خەییام وەك : عەتتار و ئیبن یەمین و شاعیرانی تر، کە چوارینەکانی خەییام تیکەڵ بە چوارینەکانیان بوونە و بە پێچەوانەشەوە ، ئەگەر میتۆدی منەکردن و پشکنینی ورد و خوێندنەوەی ورد و نرخاندن و هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن بەپێی پێوانەکانی مانا و چەمك و واژە ، بگیرێتەبەر، دگەڵ وردبوونەوە لە ژیان و تەبع و تەبیعەت و هزری ئەو شاعیرانە . هەر ئەمەش فریای باسکار موحسن فەرزانە کەوت و توانی (١٦ چوارینەی رەسەنی) خەییام بدۆزێتەوە ، کە هەندێکیان بەم نیوە بەیتانەی خوارەوە دەسپێدەکەن :

× " چون نیست حقیقت و یقین اندر دست"

کە نیوە بەیتی چوارەمی :

" در بی خبری مرد چە هشیار و چە مست"

لە کتێبەکەی خەواجە نیزامولمولك دا هاتووە بە گەواهی (**لباب الالباب**) ی **عەوفی** (م : ؟ ١٢٣٢ ز).

× " چون چرخ بەکام یك خردمند نگشت"

ئەمە لەڕاستیدا وەڵامی خەییامە بۆ :

" مردکی را به دشت گرگ درید" ی ناصر خوسرەو(١٠٠٣- ١٠٨٨).

هەژی باسە کە (سەنائی) لە چامەی وەسفی حاڵی نیشابووردا ئاماژەی بۆخەییام کردووە.

فەرزانە پێی وایە **عەتتاری نیشابووری** لە ریزی پێشەوەی ئەو شاعیرانەیە کە زۆر لاسایی چوارینەکانی خەییامیان کردۆتەو ە، بۆ نموونە:

"پیش از من و تو لیل و نهاری بودەست"

عەتتار بەم جۆرەی دەسکاریکردووە:

" پیش از من و تو پیرو جوانی بودەست" !

سەیریش لەوەیە کە **عەتتار** سەرباری ئەوەی لەژێر کاریگەریی خەییامدا بووەو، لاسایی هەندێ لە چوارینەکانیشی کردۆتەوەو، هەندێکی دیکەشی بە سووکە دەسکارییەوە بۆ خۆی قۆستۆتەوە ، لە (**ئیلاهی نامە**) دا درێغی بەرانبەر خەییام کردووە و، بە تیروتوانج لە پلەو پایەی کەمکردۆتەوە !

هەروەها **ئیبن یەمین** لاسایی چوارینەیەکەی خەییامی کردووە کە وا دەسپێدەکا:

"چون میگذرد عمر چه شیرین و چه تلخ"

بەم شێوەیە کردۆتەوە :

"چون میگذرد عمر بهر حال که هست"

**ئەمەش حافزی شیرازی یە لە :**

" ساقیا جام می بده که نیگارندەء غیب

نیست معلوم که در پردەء اسرار چەکرد"

لاسایی ئەم نیوە دێڕەی خەییام دەکاتەوە :

" کس غیب چه داند که چەخواهد بودن"

ئیدی لەسەر ئەم رەوتەو بە میتۆدی خۆی فەرزانەی توێژەر توانیوە ( ٧٠چـوارینە) ی رەسەنی خەییام بەدەست بێنێ و، پێی وایە میتۆدەکەی یارمەتی توێژەرانی دیکـەش دەدات بۆ دۆزینەوەی چوارینانی رەسەنی دیکـەی خـەییام، بـەلاّم ژمـارەی چـوارینە رەسەنەکانی خەییام لە هەموو ئەگەرێکدا لە دەوروبەری (١٧٠ چوارینە) یـەو، پاشـان دەتوانین چوارینانی دیکـەی زرِە خـەییامییان بخەینەسـەر، بـەلاّم هـەرگیز ژمارەیـان لە(٢٥٠ چوارینە) تێناپەرِێ و، ئەوسا دەتوانین بە شـێوەیەکی بابەتیانـەی (تارِادەیـەك پەسەند) حوکم لەسەر فەلسەفەی خەییام بدەین لە رێگەی شیعرەکانیەوە بەتایبەتی ، کە ئەوە دەزانین چۆن قالّبی تەنگی چوارینەی بە باشـترین شـێوە خسـتۆتە خزمـەتی دەربرین و نیشاندانی بۆچوون و باوەرِە فەلسەفییەکانی خۆی .

## رەحیم رەزا زادەی مەلیك و کۆچوارینە ئەسلّییەکەی خەییام

بەپێی بۆچوونی خەییامناس دکتۆر رەحیم رەزِازادەی مەلیك (١٩٤٠- ٢٠١٠) عومەر خەییام لە دەوروبەری سالّی (٤٤٠ ك = ١٠٤٨ ز) لەدایکبووەو، لە میان سالاّنی (٥١٥- ٥٢٤ ك = ١١٢١- ١١٢٩ ز) مردووە . لەوەیە خـەییام لـە دەوروبـەری سـالّی (٤٦٠ ك= ١٠٦٧ ز) کە تەمەنی نزیکەی بیست سالّ بووە ، دەستی دابێتە هۆنینەوەی چـوارینە ، کەچـــی لـــە چـــاڤکانییە دێرینەکانـــدا بـــە فەیلەســـووف و ماتمـــاتیکزان و ئەستێرەناس...ناسراوەو باسکراوە و، لە هیچ چاڤکانییەکدا تا سالّی (٦٠٠ ك = ١٢٠٣ ز) بە هۆزانڤان و چوارینە هۆنەر ناوی نەبراوە .

لەو چـاڤکانییانە کـە لـە سـالّی (٦٠٠ ك = ١٢٠٣ ز) تـا سـالّی (٦٥٠ ك = ١٢٥٢ ز) دانراون ، تەنیا (٤ چوارینە) دراونەتـەپالّ خـەییام . رزِا زادەی پـەیجۆر کرۆنۆلۆجیـای

بڵاوبوونەوەی چوارینەکانی خەییام تا ساڵی (٧٥٠ك = ١٣٤٩ ز) بەم شێوە رووندەکاتەوە :

- لە چاڤکانییەکانی ساڵانی (٦٥١- ٧٠٠ ك =١٢٥٣- ١٣٠٠ ز) : (**١٢ چوارینە**)
- لە چاڤکانییەکانی ساڵانی (٧٠١- ٧٣٠ ك = ١٣٠١- ١٣٢٩ ز) : (**٥ چوارینە**)
- لە چاڤکانییەکانی ساڵانی (٧٣١- ٧٥٠ ك= ١٣٣٠- ١٣٤٩ ز) : (**٧٦ چوارینە**)

کەواتە کۆی ئەو چوارینانەی لە چاڤکانییەکانی ساڵانی (٦٠٠- ٧٥٠ ك = ١٢٠٣- ١٣٤٩ ز) دراونەتەپاڵ عومەر خەییام (٩٧ چوارینە)یە. هەڵبەتە دەوروبەری (٥٠ چوارینە) یان دراونەتەپاڵ هۆزانڤانێن دیکە و، هەندێکیان گومانلێکراون .

مامۆستا رەزا زادە (٥٧ چوارینە) ی فارسی و (٣ پارچە شیعری عەرەبی) و تەنیا چامەیەکی فارسی بە هی خەییام دەزانێ ، گەرچی خەییامناسانی دیکە وەك هومایی و دەشتی هەندێك لەو چوارینانە دەدەنەپاڵ هۆزانڤانانی تر و، هەندێکیان لەبەر ناڤەرۆکی سۆفییانە بە هی خەییامی نازانن . واتە سنووری کۆچوارینەکەی خەییام بەلای پەیجۆر رەزا زادەوە لەو چوارینانە تێناپەڕی کە لەو چاڤکانی و ژێدەرانە تۆمارکراون لە ساڵانی (٦٠٠- ٧٥٠ ك = ١٢٠٣- ١٣٤٩ ز)

مامۆستا رەزا زادەی مەلیك خەییامناسێکی ناسراوە و، لە بواری خەییاملۆجیدا ئەم کتێبانەی بڵاوبۆتەوە : (دوو نامەی فەلسەفی خەییام)، (عومەر خەییام سەرقافڵەی زانست و زانین)، (سترانێن خەییام)، (زانین نامەی خەییامی = هەموو نامە زانستی و فەلسەفی و وێژەڤانییەکانی خەییام) و پێشەکییەکی تێروتەسەلی کتێبی (چوارینەکانی حەکیم خەییام ، تەرەبخانەی یار ئەحمەد رەشیدی) عەبدولباقی گولپینارلی .

هەژی ئاماژەیە کە کەس و لە هیچ زمانێکدا پێش رەزا زادەی مەلیك کۆبەرهەمی عەرەبی و فارسی خەییامی لە یەك کتێبدا بلاونەکردۆتەوە ، کە بەندە (ج.ز) وەرمگێڕاوەتە زمانی عەرەبی و پەراوێزی تێروتەسەلم بۆی ئامادەکردووە و، ئەمە چەند سالێکە لەم لا و لەولا چاوەڕوانی بلاوکردنەوەیە .

لە (دیوانی خەییام بە کوردی) پێشەکییەکەی رەزازادە مەلیکم سەبارەت بە ساغکردنەوی هۆزانی خەییام وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی .

## سەیید عەلی میر ئەفزەڵی ووردبوونەوە بەهادارەکانی

رەنگە یەکێك لە باشترین خەسلەتە چاکەکانی ئینتەرنێت ئەوەبێت ، کە زۆرجار سەرچاوەی وەهات دەخاتە بەردەست ، رەنگە بیستنی ناونیشانەکانیشیان زەحمەت بێ ، چ جای بەدەست هێنانیان ! جا سوپاس بۆ تۆڕی میهرەبان و جوانی ئینتەرنێت ، کە زۆر جار بەهانەمەوە هات و بە دەیان وتار و لێکۆڵینەوەو کتێبی دەربارەی زانست و شیعر و فەلسەفەی خەییام بە چەندین زمان ، فریا خستم و، لەوانە نزیکەی (٤٠ وتار) لەژێر سەرناڤی (باران هزار ابر سرگردان = بارانی هەزار هەوری سەرگەردان) کە شاعیرو توێژەر سەیید عەلی میر ئەفزەڵی (**ل** : ١٩٦٩) لە هەر ئەڵقەیەکدا چوارینەیەکی یەکێك لە شاعیرە دێرینەکانی بە وتارێکی چڕو سخ پێشکەش کردووە،کە خۆی لەخۆیدا بەڵگە و نیشانەی شارەزایی و قووڵبونەوەیەتی لە هونەری چوارینەدا...بەندەش بەش بەحالّی خۆم شیلەکەیم لێ هەڵێنجاوەو کردوومەتە دەسکەلا بۆ ساغکردنەوەو جیاکردنەوەی چوارینە رەسەنەکانی خەییام لە چوارینە غەوارەو ئاوەکییەکان ، بۆیەش باسکردنیم لێرەدا بەباش زانی .

یەکێك لەو شاعیرە گەورانەی کە لەژێر کاریگەریی خەییامدا بووە ، **جەمالەددین سەلمان ساوجی** یە (١٣٠٠- ١٣٧٦) کە هاومێژی حافزی شیرازی بووە . ساوجی لاسایی

چەندین چوارینەی خەییامی کردۆتەوەو، ئەمەش وایکردووە هەندێ لە دانەران و نووسەران ، ژمارەیەك لەو چوارینانە بەهی خەییام بژمێرن وەك ئەم چوارینانەی کە بەم نیوە دێڕانە دەسپێدەکەن :

× " آمد سحری ندا ز میخانه ما"

× " یاقوت لبا! لعل بدخشانی کو؟"

× "چون قسمت تو ز آنچه عقل قسمت فرمود"

بەم شێوەیەی خوارەوە دەدرێتەپاڵ خەییام :

" چون رزق تو آنچه عدل قسمت فرمود"

ئەم دوا چوارینەیە لە (تەرەبخانە) دا دراوەتەپاڵ خەییام، کەچی لە هەمان کاتدا لە هەندێ سەرچاوەی کۆنی وەك (جُنگ اسکندر مرزا) دراوەتەپاڵ شاعیر عیززەددین مەحموود کاشانی (؟!).

چەند چوارینەیەکی تری ساوجی دراونەتەپاڵ حافزی شیرازی - ش . دەبێ ئەوەش بڵێین کە ساوجی لە دوا چاپی تەحقیقکراوی دیوانەکەیدا خودانی (١١٣ چوارینە) یە و، لەهونەری چوارینەدا هاوچەرخانی خۆی بەزاندووە ، لەوانە : خاجوی کرمانی (١٢٩٠- ١٣٥٢ ز)، عیماد فەقیە کرمانی (م : ١٣٧١ ز)، ناصر بوخاری (م : ؟ ١٣٧٨ ز)، حافزی شیرازی و کەمال خوجەندی (م : ١٤٠١ ز).

**سیراجەددین قومری** (م : ١٢٢٧ یا ١٢٤٢ ز) نزیکەی (٢٠٠ چوارینە) ی هەس و هەندێ لە چوارینە بادەییەکانی دراونەتەپاڵ خەییام ، بەناوبانگترینیان ئەم جووتە چوارینەیەن

× " قرآن که بهین کلام خوانند آن را "

× " من می خورم و هرکه چو من اهل بود"

هەندێ شەریعەتزان و خۆبەشەریعەتزان ئەو دوو چوارینەیەیان بە ناشیرین و ناپەسەند لەقەڵەمـداوە و، سـێ شـاعیریش بەرپەرچـی چـوارینەی دووەمیـان داوەتـەوە ، کـە یەکێکیان **عیززەددین کەرەجی** یە :

"گفتی که گنه به نزد من سهل بود
این نکته نگویـد آنـکه او اهل بود
علـم ازلـی علّـت عـصـیان کـردن
نـزد عــقـلا ز غـایـت جـهل بود "

**واتە :**

وتـت کـە گـوناه بەلامەوە ئاسانە
پەیـڤی وا نالـێ ئـەوەی لـە چاکانە
زانستی ئەزەلی بۆ یاخیبوون بەهانە
ئەوپەڕی نەزانیـنە لەکن ئەروەنـدانا

هـەروەها هەنـدێ لـە چـوارینەی بادەنۆشـی سـیراجەددین قـومریش لـە هەنـدێ سەرچاواندا دراونەتەپاڵ خەییام ، کە ئەمانەی خوارەوە نیوە دێڕە یەکەمەکانیانە :

× " امروز که رونق جوانی من است"
× " می گرچه حرام است ولی که خورد"
× " گرچه مه روزه همچو خلخال آمد"
× " اندر رمضان به روز اگر می خوردم"
× " ماییم خریدار می کهنه و نو"

شاعیرێکی دیکەش هەیە لەژێر کاریگەری خەییامدایە ئەویش سەحابی ئەسترابادی کورد رەگەزە (م : ؟ ١٠١٠ ك = ١٦٠١ ز) کە لە ڕووی ژمارەی ئەو چوارینانەوە کە لە پاشی بەجێماوە لەنێو شاعیرانی ئێراندا بێ هاوتایە، گوایە نزیکەی (٦٠٠٠ چوارینە) ی لەپاش بەجێماوە و هەندێ سەرچاوە زیادەڕۆیان بەژمارەی چوارینەکانی کردووە ، گوایە (١٢- ٢٠ هەزار چوارینەیە) ! و لە هەندێ ژێدەرێن پاشتر ژمارەیەك لە چوارینەکانی سەحابی دراونەتەپاڵ خەییام و، ئەبووڵخەیریش .

رەنگە یەکێك لە ئاماژە گرنگەکانی باسکار ئەفزەڵی کە رێچکەی دکتۆر سیروس شمیسای گرتۆتەبەر ، ئەوەبێت کە چوارینەکانی هاوسەروان ، واتە هەر چوارنیودێڕەکانی چوارینەکە یەك سەروایان هەیە و، بە(چوارینەی تەواو) وەسفدەکرێ ، لە خەییامەوە نزیکترن تا چوارینانی کە سێ نیوە بەیتیان هاوسەروان (واتە نیوە بەیتی سێیەم سەروای جیاوازە و، بە خەسیاگ وەسفدەکرێ) ئەمەی لە لێکۆڵینەوەیەکدا روونکردۆتەوە بە ناونیشانی (چوارینە رەسەنەکانی خەییام) لە گۆڤاری(نشردانش/ ژ ٥ ی ١٩٩٥ ز) دا بڵاوی کردۆتەوە، کە تێیدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە چۆن لەسەردەمی خەییامدا، یەکێتی سەروا بەڕادەیەك لە هونەری چوارینەدا زاڵبووە کە رێژەی (٩٠٪) ی تێکڕای چوارینانی ئەو سەردەمەی گرتۆتەوە ، جا لە (دیوانی خەییام بە کوردی) رێژەیەکی بەرچاوی چوارینانی تەواوی خەییام هەیە.

جا بەم جۆرە دەبینین چۆن کرۆنۆلۆژیای دەرکەوتنی ئەو چوارینانەی دراونەتەپاڵ خەییام قۆناغ بە قۆناغ هاتووە و، لەسەرەتادا و لە ساڵی (١١٧٦ ز) دا چەند پارچە شیعرێکی عەرەبی دەرکەوتووە و، تا ساڵی (١٢٢٣ ز) جگە لە (٣ چوارینەی فارسی)

دەرنەکەوتووە و، پاشان لەساڵی (١٣٨٤ ز) دا ژمارەیان گەییە **(٥٣ چوارینە)** و، لە کۆتایی سەدەی چواردەیەمدا ژمارەیان گەییە **(٧٠٠ چوارینە)** !

ئا بەم جۆرە بۆمان روونده‌بێتەوە چۆن گەورە توێژەرانی ئێرانی و فەرەنگی ناکۆکن لە کۆنترۆڵی ژمارەی ئەو چوارینە رەسەنانەی دراونەتەپاڵ خەییام . ئینجا چونکە چەندین دەستنووس و ژێدەرێن جیاواز هەن ، ئیدی پاچڤەکانیش تا رادەیەکی بەرچاو بەپێی ئەو دەستنووس و ژێدەرانە جیاواز ن ، وێڕای کاریگەری ئەم دیاردەیە لە لیکۆڵینەوەی هزری خەییام لە ئاستێن ئێران و جیهان .

ئەم کێشەیە تا ئێستا ماوە گەرچی لەچاو نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا سووکترە . جا ئەمە هەر کێشەی چوارینەکانی خەییام نیە، بگرە زۆرینەی دیوانەکانی شاعیرانی دێرینی ئێرانی گرتۆتەوە ، بەڵام بەرادە و ئەندازەی جیاواز . هەڵبەتە پێشتر لەم بارەیەوە ئاماژەمان بۆ چوارینەکانی مەولانا جەلالەددینی  روومی کردووە ، خۆ دیوانەکەی روودەکی سەمەرقەندی نموونەیەکی بەرچاوترە ، کە گوایە لە کۆی **(دە هەزار** بەیتی شیعر) تەنیا (١٠٩٨ بەیت) ماوەتەوە ! بگرە هەندێك لە باسکاران ئاماژەیان بۆ ئەوە کردووە کە گوایە دیوانەکەی روودەکی **(سەد هەزار بەیت)** بووەو، هەندێکی دی زیدەڕۆییان کردووە و، ئەو ژمارەیەیان گەیاندۆتە (١,٣٠٠,٠٠٠ بەیت) !

جا هەر لێرەدا بەمەبەستی روونکردنەوەی زیاتری دیمەنەکە، بۆ نموونە ئامارێکی باسکاری مەزن ئەمین رەیاحی وەردەگرین ، کە جیاوازی ژمارەی بەیتەکانی (چیرۆکی زۆراب) ی ناو شانامەی فیردەوسی (؟ ٩٤٠- ؟ ١٠٢٠ ز)مان نەك هەر لە دەستنووسە کۆنەکانی داستانەکەدا بۆ کەشف دەکات ، بگرە لە گرنگترین چاپکراوە راستکراوەکانیشدا :

"- (١٠١٤بەیت)  ساغکردنەوەی : دکتۆر خالقی.

- (١٠٥٣بەیت) ساغکردنەوەی : دەزگای شانامە.
- (١٠٥٩بەیت) چاپی راستکراوەی مۆسکۆ.
- (١٤٦٠بەیت) چاپی زول مول - پاریس
- (١٤٩٠بەیت) چاپی برووخیم
- (١٦٧٥بەیت) چاپی ماکان لە کیلکەتا- هند
- (١٧٠٠بەیت) چاپی دەزگای خاوەر(رۆژهەڵات)

ئا لێرەدا دەبینین کە رێژەی زیادبوونی بەیتەکانی چیرۆکی زۆراب لە چاپی دەزگای خاوەردا لەچاو چاپەکەی دکتۆر خالقیدا گەییوەتە(٤٣٪) " !

هەروەها نموونەیەکی دیکەم لەبەر دەستدایە دەربارەی جیاوازی ریزبەندی بەیتەکانی هەندێك لە غەزەلەکانی حافزی شیرازی و ژمارەکانیان ، کە لە چەند چاپێکی تەحقیقکراو و راست کراوەدا بەرچاو دەکەوێت، بەپێی گەڕان و پەیجۆرییەکی شاعیرو پاچڤەوان و باسکاری ئێرانی ناودار ئەحمەدی شاملوو (١٩٢٥- ٢٠٠٠) ئەگەر ترسی دوورکەوتنەوەم لە چەقی بابەتە کەمان نەبوایە وەکو نموونەیەکی تر دەربارەی گشتایەتی دیاردەی جیاوازی گێڕانەوە و دانەپاڵ لێرەدا تۆمارم دەکرد .

جا بۆیە دەشێت هۆی ئەوەی کە ئەم چوارینە یان ئەو چوارینە (کە بە هەزارانە) زۆرجار دەدرینەپاڵ دوو شاعیرو هەندێ جار سێ شاعیر ، بگرە زیاتریش، ئەوەیە کە چوارینە زۆر کورتەو بەئاسانی ئەزبەردەکراو دەکەوتە سەر زاری خەڵکی ، تەنانەت زۆر جار دەکەوتە بەر دەسکاریش و، خەڵکانێکی کەم زانین و کەمتەرخەم ئەڵڵابەختەکی تۆماریان دەکرد، یان هەندێ جار دەگەڕێنەوە بۆ لایەنگری تۆمارکەر لەبەر هەر هۆیەك بۆ ئەم شاعیرە یا ن ئەو شاعیرە، جگەلە بەدنیازی هەندێك لە تۆمارکەران .

ئیدی مێژووی ئەدەبی ئێرانی پڕە لەم جۆرە هەڵانە و، کار گەییوەتە رادەیە کە کتێبان بەهەڵە دراونەتەپاڵ ئەم ئەدیبە و ئەو ئەدیبەو، بۆ نموونە دوو کتێب بەهەڵە دراونەتەپاڵ عەینولقوزاتی هەمەدانی، کە یەکەمیان کتێبی (شرۆڤەی وتە کورتەکانی باباتاهیری هەمەدانی) یە ، کەچی هی شرۆڤەکاریکی نادیاری سەردەمی پاش سەردەمی عەینولقوزاتە و، دووەمیان (خوداناسین) ـە کە هی شەهابەددین سوهرەوەردی یە (م : ۱۱۹۱ ز) !

**جا سەبارەت بەخەییام دەبێ بپرسین :**

- ئایا ماقووڵە خەییام خۆی بەزەردەشتی و رۆخێنەری بناغەی ئیسلام و، بەئالوودەی بادە و، مێبازو نێرباز...وەسفبکا، بگرە لە چوارینەیەکدا هەڕەشەی کوشتن لەخۆی بکا ؟ !

**" ای آنکە گزیدەی تو دین زردشت..."**

**- ئەی ئەو کەسەی ئایینی زەردەشتت هەڵبژاردووە.**

**" جائی بنشین عمر کە خواهندت کشت..."**

**- لە شوێنێك داسەکرێ عومەر دەنا دەتکوژن**

هەڵبەتە ئەو بوختانانەی بەخەییامی مەزندا کراون بە لێشاون ، سووکترین و ناشرینترین و دزێوترین پەیڤینیان بە زمانی ئەوەوە هەڵبەستووە، لەوانە:

**"دەستنوێژم بەترێك دشکێ " ،**

**" بۆ مزگەوت هاتووم قالییەك بدزم " ،**

**" لە سەگ کەمترم گەر ناوی بەهەشت بێنم " ،**

**" وەك کافر دەروێشم و مینا قەحپە کرێتم " ،**

**" بەپێی شەرع هیچ تاوانێکم نیە جگە لە غەدرو نێربازی و مێبازی" !**

**تەنانەت چوارینەیەك دراوەتەپاڵ خەییام ، کە تێدا مەدحی مـەغۆل دەکـا، کەچـی خەییام پتر لە (١٣٠ساڵ) پێش هێرشی مەغۆل مردووە !**

جا لێرەدا هەرئەوەندەم لەدەست دێت وتەیەکی **رەزا صدديق نەخجەوانی** وەربگـرم و هاودەنگ لەگەڵیا بڵێم : **" پایەی فەیلەسووف عومەری خەیامی نیشـابووری لـەوە بەرزترە کە ئەو چوارینە کرێتانەی بدرێنەپاڵ. دیارە خەییامیکی خـەیاڵییان بۆخـۆ چێکردووە ، بەڵگەشمان بۆ ئەم قسەیە ئەوەیە تا زەمەنی زیاتر بەسەر چوارینەکاندا بووری بێ، ژمارەیان زۆرتربووە، پێدەچێت ئەوانـەی ئـەم چـوارینانەیان گوتـووە ، خەڵکانێکی ئینتیحالچی بوونەو هاتوون چوارینانیان دژی ئایین، دژی کۆمەڵگەو دژی ئاوەزو زانست و، دژی ئاکارو پەروەردە بەناوی خەییامەوە هەڵبەستووە "**

هەڵبەتە هەر بەدنیازی هۆی ئەم دیاردەیە نەبووە ، بەڵکو نیازپاکییش ، کە دەستی گـۆڕین و دەستکاری بە درێژایی رۆژگار گەییوتە زۆر وشەی نـاو چـوارینەکانی خـەییام ، تـا لـەلای خوێنەران و بیستەرانی وەچەکانی پاشتردا ئاشناو مەفهووم بن ، بۆ نموونـە چـاوگی (مانـدن) کە لە دەقە فارسییەکاندا هاتووە تـا دوادوایـی سـەدەی شەشـەمی کۆچـی بـەکارهاتووە و، پاشان گۆڕاوەو چاوگی (گزاریدن) جێگەی گرتۆتەوە ، بۆیە هەندی لـە نووسـەرەوەکانی دواتـر دەسکاری دوا نیوە دێڕی ئەم چوارینەیەیان بەم جۆرەی داهاتووە کراوە :

" از جملهء ی رفتگان این راه دراز

..................................

تا هیچ نمانی که نمی آئی باز "

" چیزی نگزاری که نمی آیی باز"

- هیچ مەیەڵەوە چونکە ناگەڕێیتەوە

وێڕای هەموو ئەو باس و خواسەی کە پێشـتر کردمـان ، هێمـان چـەندین پرسـیار لەمەڕ چوارینە رەسەن و ئاوەکییەکانی خەییام دەمێننەوەو، هیچ باسکار و توێژەرێك

هەرچەند لەمەیدانی خەییامناسیدا سوارچاك و شارەزابێت ، ئەستەمە بتوانێت بەدڵنیاییەوە و بەشێوەیەکی بنجبڕ وەڵامیان بداتەوە . سا جێی خۆیەتی بپرسین : ئایا لەنێو بێشەڵانێکدا کە پتر لە هەزار چوارینەی ئاوەکی و غەوارە و سەدو پەنجا چوارینەیەکی ڕەسەنی تێدا تێکچرژاوە ، دەشێت راو بۆچوونەکانی خەییام دەربارەی دین و دنیا، بدۆزینەوەو هەڵێنجێنین، یاخود فەتوای دژی دەربکەین ، مینا شێخ **محەممەد** صەلاحەددینی **مونجید** بە پێی چەند چوارینەیەکی نارەسەن و ئاوەکی ؟ !
بەڕاستی جێی خۆیەتی دەگەڵ شاعیری مەزن ئیلیەتدا بپرسین :
" پاش ئەم هەموو زانینە چاوەڕوانی چ بەخشین و لێبوردنێك دەکرێ ؟ !"
بەڵێ.. پاش دەیان لێکۆڵینەوەی فراوان و قووڵ بۆ جوداکردنەوەی چوارینە ڕەسەنەکانی خەییام لە جەنگەڵێکی پڕ لە چوارینەی نارەسەن و ئاوەکی و غەوارە و دزەکردوو، هێمان لە نێو بازنەی هیدمانیدا دەتلێینەوە، ئەمما هیدمانییەك **" مەگەر نوسخەیەکی دەسنووسی کۆچوارینەکانی دروستی حەکیممان جێگەی متمانە بێت ، پەیجۆرێك بیدۆزێتەوە و ، لەم حەیرمانە رزگارمان بکات ، هەڵبەتە ئەمە هیوایەکە پێدەچێ زۆر دوور بێ "** بەپێی پەیڤینی پەیجۆرو پاچڤەوانی لێهاتوو **عەبدولحەق فازڵ** پێش پتر لە شێست ساڵێك .
هەڵبەتە لەم شێست ساڵەدا کۆچوارینەکی ئەوتۆ نەدۆزراوەتەوە ، لێ چوارینانێکی تاك و تەراکێ لەمرە و لەوێ وەك (١٧ چوارینە)ی خەییام- کە پێشتر لە هیچ دەسنووس و کتێبێك تۆمارنەکراون - و باسکاران **محەممەد** ئەفشین وەفایی و ئەرحام موڕادی لە ساڵی ٢٠١١ دا لە (گەمیەیەکی کۆنی چوارینان) دا دۆزییانەتەوە لەگەڵ (٢٣ چوارینە) ی دیکەی خەییامدا و، بەپێی هەواڵێك گوایە دەزگای (سوخەن) گەمیەکە پاش ساغکرنەوەی بڵاوبکاتەوە ، بەڵام بەداخەوە زۆر تێکۆشام و تا ئێستا نەکەوتە دەستم .

# چوارینەکانی خەییام

## ئەدگارێن هۆزانێتیی و پاچڤە و کاریگەری

مینا پێشتر روونمانکردەوە کە خەییامی زانا و فەیلەسووف سەرقاڵی کاروباری زانستیی بووە و نەپەرژاوە بایەخی زۆر بداتە بواری ئەدەبیاتی ، بۆیەش کورتترین و لەبارترین قاڵبی شیعری- کە چوارینەیەی - هەڵبژادووە بۆ گوزارشتکردن لەو هەست و سۆزو گوداز هزرو بیرانەی لە دڵ و دەروونیا دەپەنگانەوە و بەمێشك و خەیاڵیدا دەبوورین و، چوارینەکانی پتر فەلسەفەئامێز و رەخنەئامێزیش بوون لە بواری ئایینی و کۆمەڵایەتییەوە ، بەڵام ئەفسووس بەهۆی چوارینانێکی ئاوەکی و غەوارەو نارەسەنی هەرە زۆری هەڵبەستراو تێئاخێنراوو تێخزاو بە ناوی خەییامەوە ، ناوەرۆکی هزریی چوارینەکانی بۆتە چێشتی مجێورو هێندەیان لێکدژ لەخۆگرتووە ، کە خەییام میناك کابرایەکی خودان میزاج و سرووشتێکی سەیروسەمەرە دێتە بەرچاو، کە بەجارێ هەموو ئەمانەیە : ئەبیکۆڕی ، خواخواز، دەهری ، بەدکار، کەچڕەو، مەتریالیست ، نازانینڕەو ، سۆفی ، جەبری ، زەندیق ، گەشبین ، رەشبین، گونووسی ، دۆنایدۆن باوەر ، تلیاککێش، شەهوەتباز ، وەرزشیاری دەروونی ، شەواڵ پیس ، خواناس ، خوانەناس ، پەتیارە ، دیندار ، خۆسەر ، یاخی و شۆڕشگێڕ دژی هەموو شتێك...!

ئاری خەییام ئاوها وێنەدەکرێت و، لە هەمان کاتیشدا بە زانایەکی گەورەی پسـپۆر و جەختمەند و رەسەن و سەنگین لە بوارێن بیرکـاری و گەردووونناسـی و پزیشـکیی و فەلسەفەدا دەژمێردرێت و ، بگرە رووناکبیرێکی شارەزای بەرچاویش لە بوارێن ئایین و زمان و مێژوودا ، بە رادەك کە زۆربەی گەورە رۆشنبیرانی سەردەمی خۆی و دواتریش بە (ئیمام) ، (حوججەتولحەق) ، (دەستوور) ، (غیاسەددین) ، (حەکیم) و(فەیلەسووفی جیهان)...ناویان بردووەو وەسفیانکردووە .

هەندیی ٚ باسکار هۆی ئەو هەموو نازناوە هەڤدژانەیان بەوە لێکداوەتەوە ، کە پتر زادەی شرۆڤە و راڤـە و هیرمۆنـەتیکی چـوارینەکانی خـەییامن ، چـونکە جیهانی شیعر وەك جیهانی زانست نیە و، زمانەکەی زمـانی هێمـا و خـوازەو مەجازە ، وەکو زمانی بیرکـاری سـنووردار و بنجـبڕ نیـە ، ئەمـەش لـەرووی مەبدەئییەوە دروستە ، بەڵام سەبارەت بە خەییام ئەو کاتە راست دەبوو ، ئەگەر شاعیرێکی گونووسی بوایە و رەمـزو درکـە و خـوازەی داخـراوی بەمەبەسـتی داخستنی زیاتر بەکار بردبایە ، کەچی خەییام وا نیە ، مەگەر بـە دەگمـەن . بـەڵێ گوتـاری شـیعری خـەییام زۆر ئاشـکراو روون و رەوانـە و، وردبوونـەوە لەچوارینە رەسەنەکانی و پارچە شیعرە عەرەبی و فارسییەکانی ئەوە دەسەلمێنن کە خەییام شاعیرێکی سۆفی یا عیرفانی پەتی نیە ، بەلکو زاناو فەیلەسووفێکی مەیلداری تەصەووف وعیرفانە ، لە هەمان کاتدا نە میناکی ئەبوو نواسە و نە عومەر بن ئەبی رەبیعـە و نـە ئـەبوو عـەلای مەعـەڕڕیش . بـەڵی خـەییام هۆزانڤانی غەزەل و دلّداریی و بادەنۆشیی و بەنگان و بیٚ پەروایی و بێشەرمیی و، کەمتەرخەمیی و بەرەڵایی نەبووە ، تەنانەت رەشبینییەکەشی رەها نەبووەو،

تـــا ئێســـتا نادروســـتی ســـەدان چـــوارینەی بادەگوســـاریی و کوفرئـــامێزو ئیباحییەتخوازیی (کە بەنەهەق دراونەتە پاڵ خەییام) سەلماوە و ساغبۆتەوە.

لێرەشدا بەپێویستی دەزانم هەڵسەنگاندنی خەییامناسی تورکی ناڤدار گولپینارلی بخەمە روو ، کە لە روانگەی نامە فەلسەفییەکانی خەییامەوە ئێژێ :

"خەییام لە حیکمەت و فەلسەفەدا بە پاشینەی ئیبن سینا دەژمێردرێ و، بڕوای بە فەلسەفەی حەکیمان هەبووە و، مەیلیشی بەلای تەصەووفا هەبووە . هەڵبەتە خەییام سۆفییەکی پەتی لە سۆفییە راستەقینەکان نەبووە وەك حەکیم سەنائی و جەلالەددینی رۆمی ، لێ میناك ئیبن سەبعین و شەهابەددینی سوهرەوەردی کوژراوو شێخ بەدرەددینی کوڕی قازی سیماونە بووە و، تەصەووف و بیروباوەڕی حەکیمانی ئامێتەکردووە ، مەیلی پتر بەلای تەصەووف و رەفتاری سۆفییانە نەك بەلای فەلسەفەی پەتیدا، ئەو راستییەمان بۆ دەنوێنێ کە خەییام بێ ئۆل نەبووە و، ئەوانەش بە زەندیقی دەزانن بە هەڵەچوونە "

گولپینارلی پێی وایە خەییام لە گەلێك لە چوارینەکانیدا زانست و ئاوەز دەخاتە ئەولاوە و، لە فەلسەفەوە بۆ تەصەووف هەڵدێ و، رووادەچێتە نێو هاماجی عیرفانەوە، بەڵام لەورەش ئۆقرەناگرێ و دەگەڕێتەوە بۆ جیهانی ئاوەز و، بەدەستی گومان و ئازارەوە گینگڵدەخوا و، رەوشی نالەبار و نابەجێی زەمانە بەرەو حیکمەت و فەلسەفە رایدەکێشی ، کە پڕوپووچی زەمانەی بۆی دەردەکەڤێ و ناتوانایی ئاوەز و حیکمەت دەبینێ ، بۆیە دیسان پەنا بۆ تەصەووف دەبا !

جا خەییام ئەچنەوە بەپێی وەسفی گولپینارلی : " لە بیروباوەڕیا لەسەر چوونگەی حەکیمانەو ئیمانی عیرفانییە" و " بە پێگەی قەدەری ئیماندارەو میناك مەلامەتییەکان دەدوێ "

ئینجا با بۆ کرۆکی بابەتەکەمان بگەڕێینەوە ، کە سەبارەت بەخوازەیە لـە هـۆزانی خەییامدا . بێگومان خوازە لەهەندێ چوارینە رەسەنەکانی خەییامدا هەیە ، بـەپێی چوونگەی (**مارتن نك**) کە بەو حیسابە بەکار هاتووە : " تەکنیکێکی زمانەوانییە ، مانای هەنبەربوونە لە نێـوان دوو شـتی جیـاوازدا، بەبـەراوردکردن لـە نێوانیانـدا " ئەوەش بەکارهێنانی وشەیەك بۆ مانایەکی جیاواز لە مانا راستەقینەکەی ، واتـە بـۆ مانایەکی خواستراو بەکاردێت ، هەڵبەتە خواستن لە تـەکنیکی لێکچـوون (تەشـبیە) جیاوازە ، چونکە (وەکیەتی= تەشبیه) پێویستی بە ئامرازێن لێکچوون هەیە : (ك ، مثـل ، کـأن...= وەك، مینـاك ، چـمان...)کە بەراوردکردنەکـە راسـتەوخۆ ئـەنجام دەدرێت.

خواستن (ئیستیعارە) بە کۆڵەکەی شیعری باش دەژمێردرێ و، شیعری خـەییام پـڕە لە خوازە باوەکان و، لە روانگەی فەلسەفیی خەییامەوە بۆ شتان هەڵقوولاوە ، کە لە نۆڕینی مرۆڤاندن (أنسنە) واتە بە ئینسانکردنی شتەکانە ، کە خەسـڵەتێن ئینسـانی گیانلەبەر وەردەگرن و سەوداdەکەن ، جا بەپێی دەست نیشانکردنی مارتن نك :

" شتێك نیە لە نۆڕینی ئەودا تـەنیا شـتێکی رووت بێـت ، بـەڵکو لـەدڵی خۆیـدا ئینسانێکەو شێوەی شتێکی وەرگرتووە و، ئەمە نهێنی سروشـتی هونـەری خواسـتنە لەشیعری خەییامدا " گەشترین نموونەشمان (گۆزە) یە ، کـە لـە چـەندین چـوارینەی خەییامدا میناك بەدەنی مرۆڤی گچکەکراوەیە (بەگشت ئەندامەکانیەوە = سەر ، مل ، دەم ، باڵ ، زگ...) وێڕای زیندوویی و ژیانی بە هەست و سۆزو هزرو ئاخاوتنەوە ! بۆ نموونە :

" جارێکیان لە گـۆزەسـازێ گۆزەڵـەم کـڕی
گـۆزەڵە هاتەگـۆو گشـت رازەیـلی دەربڕی :

شـــاهـێـك بـووم و جامی زێـڕیـنم هەبـوو
وا ئیسە بوومەتە گۆزەڵەی هەر مەیـخۆری"

هەڵبەتە زۆربەی رەگەزە رەوانبێژییە شیعریەکانی خەییام: لێکچـواندن و خواسـتن و درکە لە کەلتوورە زانستی و زانینیەکەیەوە هەڵقووڵاوە : ئەندازە ، بیرکاری ، فیزیـا، کیمیا، مۆسیقا، گەردووناسی ، زانینی میتۆلۆجی و ئایینیش ، بۆ نموونە (بازنە) بۆ هێمای ژیـان و تەمـەن دەخوازێـت و، رەگـەزەکانی سروشـتی فیزیکـی و سـتێران و هەساران و شتانی دی ، بۆ بەرجەستەکردنی هەست و هزرەکانی بەکاردێنێت...

جا لێرەدا پێویستە ئاماژە بۆ خاڵێکی گرنگ بکـەین ، کـە زۆربــەی پاچـڤەوانانی چوارینەکانی خەییام لێی بێئاگابوونە ، ئەویش ئەوەیە کە خەییام پتر ئەو تاکواژانەی بەکارهێناوە کە شەقڵ و مـۆرکی ئێرانییـان هەیـە و، ئێـرانێتی خـۆی (کەلکەلـەی نیشتمانپەروەری خۆی) دەنوێنن ، گەرچی بەکەلتووری عـەرەبی- ئیسـلامیش تێـرو پاراو بوو . جا ئەو تاکواژە و پەیڤانە کـە تایبەتمەنـدی تۆبـۆگرافی (هـەورازو نشـێوو هەڵـەت) ی چـوارینەکانی پێکـدەهێنن ، دەبـێ لـەکاتی وەرگێڕانـدا زۆر بـەوردی مامەڵەیان لەگەڵدا بکـرێ ، دەنـا شـیعرەکان نـەك هـەر تایبەتمەندییـە خەییامییـە ئێرانییەکەیان لەدەست دەدەن ، بگرە بەدگۆڕ (مەسخ) دەبن ! لە و واژانـە : (ایـزد ، یزدان = ئێزد ، یەزدان) لە زەردەشتیدا ، کە لەگـەڵ هـەردوك تـاکواژەی (خـودا) ی فارسی و (الله) ی عەرەبیدا لە چەمکدا دەقاودەق نـین ، مەگـەر لەگـەڵ تـاکواژەیێن (إلـە) و(رب) دا، هـەروەها سـەبارەت بـە واژەی (چـنگ = چـەنگ = **Harp** کـە ئامێریکی مۆسیقای ژێدارە و حەوت ژێی هەیە و بە ئەنگووست لێدەدرێ) ، هەڵبەتە (چەنگ) نە (صنج) و نە عوود و نە تار و نە (رەبابە) یە، کـە زۆربـەی پاچـڤەوانانی

عەرەب بە یەکێك لەو واژانە پاچڤەیانکردووە ! یان وشەی (نوروز = نەورۆز) کە رۆژی یەکەمی ساڵی نوێیە و جەژنی گەورەی نەتەوە ئێرانییەکان و غەیرە ئێرانیش ، زۆر لە وەرگێڕان (ربیع = بەهار) یان وەرگێڕاوە ، کە وشەیەکی گشتگیرە و تایبەتمەندی (نەورۆز) ی نیە ، هەروەها واژەی (فلك = فەلەك) کە بەزۆری بە (ئاسمان) پاچڤەکراوە و، (سبوی کاشی = شەربەی کاشانی) کە هیچ پاچڤەوانێکی عەرەبی بە وردی پاچڤەی نەکردووە و، واژەی (بام) کە هەردوك مانای (بەیانی) و(سەربان) دەگرێتەوە . وێڕای ئەم وشانەش ناڤێن ناودارە ئێرانییەکانە : (جەمشید ، بەهرام ، پەروێز ، کەی قوباد ، فەرەیدوون و کەیکاووس و کەیخوسرەو...) و تەنانەت ناوی شارانی (بەلخ ، بەغداد و تووس) کە هەموویان رەهەند و چەمك و مانای تایبەتیان هەیە و، رەگئاژۆن لە مێژوی ئەفسانەیی و راستەقینەی ئێرانی و، میتۆلۆجیاو فۆلکلۆری ئێرانیدا، جا ئەگەر لە پاچڤەی ئەم چوارینە یان ئەو چوارینە بگۆڕدرێن ،یان لابدرێن ، تایبەتمەندی ماناو ناڤەڕۆکە رەسەنەکەی لەدەستدەدات .

*

خاڵێکی دیکەی زۆر گرنگ هەیە، ئەوەیە کە چونکە زۆربەی ئەوانەی چوارینەکانی خەییامیان بە هەڵبەست وەرگێڕاوە ، بێ ئاگا بوونە لە هەقیقەتی جۆشخواردن و هەڤبەندی بونیادو ناڤەڕۆکی هەر چوارینەیەك ، بونیادی گەلێك لەچوارینەکانیان وێران و ئاوەژوو کردووە ، کە تەنانەت بۆتە هۆی شێواندنی نێوەرۆکەکانیشیان !

جا چونکە ئەمە پێویستی بە روونکردنەوەیە ، شێلەی شیکردنەوەکەی دکتۆر لوتفوڵڵا یار محەممەدی ، کە دەربارەی پاچڤە هەڵبەستڤانییەکەی فیتزجیراڵدە ،

دەخەمە بەردەست . دکتۆر یار محممەدی گەییوەتە ئەو دەرەنجامەی ، کە فیتزجیرالّد دەرکی بونیادی (فۆرم و ناڤەرۆك) ی چوارینەی هەبووە ، کە رێسایانە بەگشتی لە سێ رەگەز پێکدێت : (توصیف = وەصف/ توصیە = ئامۆژگاری/ و تعلیل = هۆدۆزی) لەوەصفدا شاعیر دیمەنێکی سروشتی یان رووداوێك یاخود حالەتێکی ژیان وەصفدەکات و، لە ئامۆژگاریدا شاعیر داوا لە وەرگر (دوێندراو) دەکات کە کارێك بکات یان هەڵوێستێکی هەبێت ، هەڵبەتە بەزۆری لەرێگەی بەکارهێنانی (فرمانی داخوازی) یەوە و، لە هۆدۆزیدا شاعیر بە بەڵگەیەك ئامۆژگارییەکەی دەسەلمێنێ یان هۆی ئامۆژگارییەکە بە بەڵگەیەك روندەکاتەوە.

لیرەشدا ئەم چوارینەیە وەك نموونە پێشکەش دەکەین و (وەسف) دەخەینە ناو ئەم کەوانەیە{...} و (ئامۆژگاری) دەخەینە ناو ئەم کەوانەیە (...) (هۆدۆزی) دەخەینە نێوان ئەم دوو هیلّە هاوتەریبە/......./:

{وقت سحراست} (خیز ای مایەءناز
نرمك نرمك بادە خور و چنگ نواز)
/ کاینها کە بەجایند نپایند کسی
وآنها کە شدند کس نمی آید باز/

{وا سپێدەیە} (دە ڕابە ئەی مایەی ناز
هێدی هێدی مەی بنۆش وچەنگ بژەنە)
/چکو هیچ کەس نامێنێ لە وانەی لێرەنە
کەسیش نایەتەوە لەوانەی کە رۆیشتنە/

هەر بەو پێوەدانگە کە هیچ رێسایەك لە ریزپەر بەدەر نابێت ، هەندێ چوارینە ریزبەندی رەگەزەکەیان دەگۆڕێ ، یا رەگەزەکەیان لەدەستدەدەن ، یان دوو رەگەزیان

تێکەڵدەبن ، یان رەگەزی (وەسف) بەسەریاندا زاڵدەبێت ، یان رەگەزێکی پەنامەکی و ناراستەوخۆ لەخۆدەگرن ، کە لێرەدا دەرفەتی روونکردنەوەی هەموویانمان نیە و، تەنیا نموونەیەك بۆ روونکردنـەوەی ئـەوەی کـە هـەردوو رەگـەزی ئامۆژگـاری و هـۆدۆزی شاراوەی ژێر دەسەڵاتی رەگەزی وەسفمان بۆ رووندەکاتەوە :

روزی است خوش و هوا نه گرم است و نەسرد
ابـر از رخ گـلـزار هــمـــی شـــــوید گرد
بـلـبـل بـه زبـان پـهــــلوی بـا گـل زرد
فـریـــاد هـمـــی زنـــد کـــه می باید خورد

**واته :**

رۆژێـکی خۆشەو کەش نە گەرمەو نە سەرد
هەور گشت گەردی لە رووی گوڵزار شۆردەوە
بولبول بە زمـانی پەهلەوی وەل گـوڵی زەرد
هەموو فریـادیانە کـە دەبێ مەی بخـۆیـەوە

**{ ئەم چوارینەیە بە کەمێك جیاوازییەوە ، بە هی موعززی نیشابووری (١٠٤٨-١١٢٧) دەژمێردرێ / ج . ز }**

*

خەییام لە چوارینەکانیا خۆی لە مەبەستە شیعرییە باوەکان نەداوەو لـە سـتایش و داشۆرین و غەزەل و لۆرینـەوە دووربـووە ، واتــە خـۆی لـەدۆزە هەنووکـەیی و شـتە

بچووکەکان نەداوە ، کە خەمی زۆربەی شاعیران بووە . هەروەها چامەی درێژی نەهۆنیوەتەوە ، بەڵکو سەرقاڵی بەرزکردنەوەی کولوکۆڤان و نیگەرانییە وجوودیەکانی ئینسان بووە ، لە بازنەی سەرسامیی و حەیرمانە هەرمانییەکانیا و، لە قاڵبی چوارینەدا پرسیارە کەونییە جەوهەری و سەرنووشتییەکانی خستۆتەروو، کە هەمان ئەو پرسیارانەن وا ئەدەبیات و هونەری تیرەی بەشەر لە داستانە جاویدانەکەی گلگامێشەوە ، بەوپەڕی سادەیی دوور لە هەر رتووشکاری و جوانکارییەك و، بەوپەڕی کورتی و رەوانبێژییەوە خستوونیەتەڕوو .

ئەوەی مایەی سەرنجە ئەو فەرمانە داخوازیانەیە کە بەسەر (رەگەزی ئامۆژگاری) دا زاڵن ، لە دەڤۆکی سەپاندنەوە دوورن و، زۆربەی ئەو فرمانانەی لەچوارینەکانیدا هاتوون (کە هەندێکیان دەچنە خانەی ئیلتیفات = خەڵکی تر دەدوێنێ و خۆیی مەبەستە) بریتین لەو ئامۆژگاریانەی کە لە قووڵایی وبەرینی حیکمەتی ئەزموونکراوی خەییامەوە هەڵقووڵاون و زادەی متمانەی بتەوی خەییامن ، کە بەو هەڵوێستە فەلسەفییە (گومانـدار) و(هەیدۆنی = لەزەتخوازی) ی خۆی دژی ئەو دۆزەخەی واقیع کە مەرگ بە هۆکارو لق وپۆپە زۆرو زەبەندەکانیەوە بەسەریا زاڵە، واتە بە پێچەوانەی ئامۆژگاریانی ریابازانی بەناو شەریعەتزان ، کە بە درۆ دەلەسە و چاوڕاو مەینەتبارانی سەرزەمینیان فریودەد او هانیاندەدان ، مەرام و ئامانجە دنیاییە رەواکانیان دوابخەن و چاوەنۆڕی نیعمەتی ئەو دنیا بن . چونکە خەییامی زاناو فەیلەسووف حەقیقەتەکانی ژیان و مەرگی بەقووڵی و بەرینی دەرك کردبوو، بۆیەش لە گوتارە شیعرییەکەیدا هانی مرۆڤی دەدا کە سەرفرازانە بژی و سواڵی بەزەیی لەکەس نەکات و، چاویشی لەدەستی کەس نەبێت . هەرچەندە فەلسەفەو حیکمەت بەسەر چوارینەکانی خەییامدا زاڵە، بەڵام تەڕی و بڕی و جوانییەکی سەیریان تێدایە!

*

هەروەها روونە کە خەییام لە زمانە شیعرییەکەیدا لاسایی زمانی هیچ شاعیرێکی پێشتری نەکردۆتەوە و، زمانیکی سادەو رەوان و سخوچڕی بۆ گوزارشت لە هەست و هزری خۆی بەکاربردووە ، دوواتر زۆر لە شاعیران لاساییان کردۆتەوە ، بەڵام کەسیان نەیتوانیوە بگاتە ئاستی خەییام و، بە هەمان سادەیی دڵگیری ئەو هەست وسۆزو هزرە مرۆڤانییە جەوهەرییەکان دەربڕێت ، چ جای توانا دەگمەنەکەی خەییام لە هەڵبژاردنی پەیڤێن هاوئاهەنگ بۆ گوزارشتکردن لە هەست و هزرەکانی بەجۆرێکی رەوان و بێ گرێ و، سادەیی لێکچوون و خوازەکانی هەر باسی ناوێ . سا لێرەوە هۆی نەمریی وجاویدانیی ئەم چوارینانەمان بۆ دەردەکەوێ، نەمرییەکەیان لەوەدایە کە خەییام لە هۆنینەوەیاندا مەبەستی راستەوخۆی نواندنی شاعیرییەتی خۆی نەبووە ، بەڵکو ویستویەتی ناڤەڕۆکە هزرییە قووڵ و فراوان و بوێرەکانی بەگوتارێکی رەوان و پاراو بگەیەنێت و، خۆی لە بەکارهێنانی زمانی ئالۆزو سەخت و دەستکردو ئارایشکراو دوور گرتووە .

لێرەشدا پێویستە رای فرووغی و غەنی دەربارەی (٦٦) چوارینە کۆدەکەیان کە زۆربەی چوارینە رەسەنەکانی دیکەی خەییام دەگرێتەوە دووبارە بکەینەوە :

" زۆر ساناو سادەو بێ ئارایشتن و لە رواڵەتبازی دوورن ، بگرە لە خەیاڵی شیعریش بێبەشن ، تەنانەت دەتوانین بڵێین کە جگە لە کێش و سەروا چیتریان لە هونەری شیعرا تێیانا نیە ، بەڵام ئەوپەڕی زمان پاراوی و رەوانبێژیێ تێیانا هەیە و، دروست و کورت و مکوومن ، هەموو واژەکانیان قاڵبن بۆ مانا ، کەم و زیادیان تێدا نییە و،

هیچ عەیب و خەوشێك . زۆر روونە کـە بێـژەریان مەبەسـتی واژەبـازی و پاراوبـازی نەبووەو، هەموویان بە دەربـڕینی مانـاوە بەنـدن. ماناکـانیش بـە نـازکی و وردی و نایابییان بەسەر گشـت خـەیاڵبازی و خۆدەرخسـتنێکدا زاڵـن ، زۆر جیـددی و بـێ گاڵتـەبازین (...) و، نـاوەڕۆکێن چـوارینەکان هـەموو بەرهـەمی خـووی دانایـەکی هزرڤانی دوور ڕوانە..."

❋

سیمایەکی تایبەتمەندی دیکەی شیعرییەتی چوارینەکانی خـەییام ، لـە زاڵبـوونی هەستی ناسك و زەوق و سەلیقەی جواندایە ، ئەوەش بە بەرجەستەکردنی دیمەنـەکانی سرووشتی دلڕفینە بە هەموو رەگەزەکانیەوە : خۆر ، مانگ ، هەور ، باران ، جۆگەڵە ، رووبار ، ئاو ، با ، ئاگر ، خاك ، شنە ، بەیان ، گەرد ، ئاسمان ، ئەستێرە ، شەو ، کـازیوە ، رۆژ ، سـەوزەزار ، باڵنـدە ، ئـاژەڵ ، گـوڵ و، رەنگـەکان.... هـەروەها سرووشتی دەستکردو شتانی دیکـەش : کۆشـك و تـەلار ، گـۆڕ ، کـەلاوە ، خـان ، بێستان ، مەیخانە ، خشت ، کووپە ، گۆزە ، شەربە ، سـوراحی ، جـام ، پـەرداخ ، پیاڵە ، بادە ، ئەندامەیلی تەنی ئینسان ، چەنگ و ئاوازەکانی...سەرباری ئەوانـەش ناوی پێنج - شەش پادشای ئێران و دوو سێ شارو دۆزەخ و بەهەشت و یەزدان...

سەیریش لەوەدایە کە خەییام بەو فەرهەنگە شیعرییە بچـووکەی و بـێ وشـەبازی و درێژدادڕی توانیویەتی وێنەی دیمەنانێکی جوان و دلڕفێنی تـەژی خۆشەویسـتی ژیـان بکێشێت ، وێڕای وەبیرخستنەوەی ئەو حەقیقەتە تاڵە کە تەمەن و ژیان زۆر کورتن و مەرگی موحەتتەم هەمیشەو لە هەر ساتۆکەیەکدا لە بۆسەدایە ، تا ئینسان هەسـت

بەنیعمەتـەکانی ژیـان بکـات و هـەموو سـاتێکی ژیـان بـە کـاری چـاك و خۆشـی بقۆزێتەوە...

لەمەشـەوە خەسـڵەت و تایبەتمەنـدی بتـەوی و رەسـەنی و جیـددی چـوارینەکان دەردەکەوێ ، کە گاڵتەو گەپ ، داشۆرین ، ستایش ، لۆرین و پیاهەڵدانیان تیا نیە ، بەڵکو لەهی (فـەیز) ی پەنـدیاریی (حیکمـەت) ، کـە چـوارینەکان لـەو خولگەیـە دەسوورێنەوە ، کـە خولگـەی بیرخسـتنەوەی مـەرگی موحەتتـەم و کـورتی تەمـەن هەرچەندەش درێژ بێت و، وەیشـوومەی رۆژگـار و وەزەنـی تـیرەی بەشـەرو سـتەمی قەدەرە و، هانی ئینسان دەدەن ، کە بە سەرفرازی و خۆشەویستی بژێت ، بێ تـرس و لەرز لە مەرگی حەتمی زوو یان درەنگ...واتە سووربوون لەسەر ژیان بەکوێرایی چاوی مەرگ و زوڵمی سوڵتانان و واعیزە دەڵەچە فیقهبازەکان ، کە دەستیان بەسەر هەموو نیعمەتەکانی ژیاندا گرتووە و، بە (کەلاکی بۆگەن و فانی) وەسـفیدەکەن و، خـەڵکی بێنەوا و کلۆڵ هاندەدەن کە دان بەخۆدابگرن و زاهد بن و چاوەنۆڕی نیعمەتێن ژیـانی جاویدی ئەو دنیا بکەن ، چمان یەزدان بەشەری هەر بـۆ ئـەوە ئافرانـدبێ ، کـە لـەم دنیایە ئازار بچێژن و چاوەڕوانی نیعمەتی ژیانی ئەو دنیا بکەن !

رەنگە لێرەدا سوودبەخش بێت ، کرۆك و جەوهەری ئەو بەراوردە قووڵەی زانا دکتۆر کـەماڵ ئـەبو دیـب لـەنێوان زمـانێن هـەردوك شـاعیری چـوارینەڤان خـەییام و نیزامەددینی ئەصفەهانی (م : پێش ١٢٨١ ز) بهێنینەوە ، بۆ زانینـیش ئەصـفەهانی زۆربەی چوارینەکانی بە زمانی عەرەبی هۆنیوەتەوە و، گەلێکێشی بە زمانی فارسـی و، هەندێکیشـی (مولەممـەع) بـە تێکـەڵاوکردنی زمـانێن عـەرەبی و فارسـییە . ئەصفەهانی بەچوار چوارینە وەڵامی هێرشئامێزی چوارینەیەکی بەناوبانگی خەییامی

داوەتەوە ، لە کاتێکا بەخۆی قازییەکی پایەبەرز بووە و ستایشی سەردەمی مەغۆلی دڕندانی دەکرد:

" زمانی ئەصفەهانی لە هەڕەت و لوتکەی خۆیدا زمانی دڵەڕاوکێیەکی قـووڵ بـوو، لەنێوان کۆمەڵێك دوالیزمێن هەڤدژی بنەڕەتی لە کەلتوورو زمـان و هـزر، و بوونـدا (........) زمانێکی نیگەرانی ناجێگیرە لەنێوان کەلەپوورێکی ئایینی ، کە ئینسان و خوا بەڕوونی لێك جیادەکاتەوەو، کەلەپوورێکی دی ، کە تێدەکۆشێت لەو مەودایـەی نێوانیان بپەڕێتەوە و، حەقیقەتی هەر یەکێکیان لـەوی تـردا بدۆزێتـەوە ، زمـانێکی نیگەران و نائارامە لەنێوان بیابان و زمانی شیعری بیابان و واقیعـی شـارو پرشـنگە ژیارییەکـەی . بـەم نیگەرانییـە روونـە ، بۆمـان دەردەکـەوێت ، کـە شـاعیرییەتی ئەصـفەهانی شـاعیرییەتێکی نـاوازەی ئەوتۆیـە ، کـە لـە شـاعیرییەتی خـەییام نزیکدەبێتەوە {بەڵام نیگەرانی لە دڕدۆنگی ئەصفەهانی لە هەنبەر هزری خەییامـدا دیارو ئاشکرایە ، نەمازە لە پەرچدانەوەی چوارینەیەکی خەییام بە چوار چـوارینە !} کەچی لەپشتی ئـەم نیگەرانییـە متمانەیـەکی قـووڵی پـڕ لـە دڵنیـایی ئاوێتـە بـە جیهانبینییەکی روونی ئایینی پەنهانە، سا جیـاوازی گەوهـەری نێـوان شـاعیرییەتی خـەییام و شـاعیریەتی ئەصـفەهانی لەمەدایـە ، کـە شـاعیرییەتی خـەییام تاوێـك شاعیرییەتێکی گومانی قووڵە و، تاوێکیش ملکەچییەکی تـەواوە بـە متمانەیـەکی نیستی نەهلیستییە و، بە دەگمەن گوزارشت لە دڵنیاییەکی رووحی بۆ سیسـتەمێکی پایـەدار دەکـات (.......) کەچـی شـاعیرییەتی ئەصـفەهانی لەجەوهـەر و کرۆکـدا شاعیرییەتێکی متمانەوانییە و، هەوڵی دەربازبوون دەدا لەو بەها هزری و ئاکاریانەی کە پەیوەسـتن بـە رەگوڕیشـەی ئـەو جیهانبینییـەی ، کـە متمانەوانییەکـەی لێـوە هەڵدەقووڵێت ، بەڵام هەمیشە رەگاژۆ تێدا دەمێنێتە و، هیچ گومانێك دانامەزرێنێ

و گەشە پێ نادات ، بەمەش ناگاتە نەهلیزمییەت ، مەگەر لە گۆشە نیگای روانینی کەلەپووربیەوە وەك لە تێڕوانینی توانای ویرانکارانەی قڕکردەی زەمەن دەرهەقی ئینسان و هەستی (بوون) دەردەکەوێت ، جا بۆیە ئەصفەهانی لە لوتکەی شاعیرییەتیشیا، لە پلەوپایەی مەزنی خەییام نزمترە و، وورووژان و مشتومڕیشی کەمترە "

ئەمەیان سەبارەت بە چوارینە فارسییەکانی خەییام بوو ، لێ سەبارەت بەشیعرە عەرەبیەکانی (کەس گومانی نیە هی ئەو نەبن) کە بریتین لە نۆ کۆپلە و پارچە (= ٣١ بەیت) بە پێی زانینم باسکاران کەم لێی کۆڵینەتەوە ، چ ئێرانی و چ بیانی لەوانە: عەبدولحەق فازڵ، دکتۆر یووسف بەککارو دکتۆر عەبدولمونعیم حەفنی کە دەڵێ :

-" پیدەچێ خەییام لە نووسینە عەرەبیەکانیا جیاواز بێ لە نووسینە فارسییەکانی . لەعەرەبیدا زیاتر پابەندبووە ، کەچی لە فارسیدا رەهاو سادەنووس و رەوان بووە . رووحی نووسینە عەرەبیەکانی بەشێوەیەکی گشتی رووحێکی (سامییانە) یە ، کە جیاوازە لە رووحی (ئاریای) ی نووسینە فارسییەکانی ، کە گومان بەسەریاندا زۆر زاڵە و، ئارەزووی فەلسەفەڤانیی و، بوێری ئاراستەی ئەو پرسیارانە کە یاخیبوون دەنوێنن و، ئەمەش لە نووسینە عەرەبیەکانیدا نیە و، کە ئیمانداریان بەسەرا زاڵە . خودی خەییام لە نووسینە عەرەبییەکانیدا خودێکی کۆمەڵڤانییە، بەڵام لە نووسینە فارسییەکانیدا خودێکی تاکڕەوە..."

نازانم چۆن و بۆ ئەم پەیجۆرە هوشیارە خلیسکاوەتە نێو چاڵی رەگەزپەرستیەوەو، گوایە بە مەزندەی خۆی بەراوردێکی بابەتیانەی لە نێوان (رۆحی سامی !) و (رۆحی ئاری !) کردووە بە لەتکردنی (خودی خەییام بۆ دوو لەت) ! لە کاتێکا رەفزی بۆچوونەکەی هزرڤانی فەرەنسی ئەرنیست رینان دەکەین کە هاوشێوەیەتی و، گاڵتە و

سووکایەتی بە عەرەب و موسلمانان دەکات ، بە جەختکردن لەسەر هەڤدژی نێوان ئارییەکان و سامییەکان... بێ گومان نازیزم و فاشیزمی ئەوروپایی ئەم جۆرە تێزە رەگەزپەرستانانەیان بۆ دڕندەترین قەسابخانە دەرهەق بەمرۆڤایەتی قۆستەوە .

ئینجا پێویستە گوتەیەکی شاعیری گەورە ئیلیەت بێنینەوە یاد : " کاتێ شاعیری گەورە دەربارەی خۆی دەنووسێت ، دەربارەی رۆژگارەکەی خۆی دەنووسێت " کە خەییامیش دەگرێتەوە .

بەهەر حاڵ شیعرە عەرەبییەکانی خەییام کە تا ئێستا (٩ پارچە و کۆپلەن = ٣١ بەیت) تیشکێکی باش دەخەنە سەر کەسایەتی و شیعرو فەلسەفەی خەییام و ، لەگەڵ چوارینە رەسەنەکانیدا دەبنە کۆدو پێوەری متمانەپێکراو بۆ دۆزینەوە و دەسنیشانکردنی چوارینە رەسەنەکانی دیکەی خەییام .

❋

راستە ئەو چوارینانەی کە دراونەتە پاڵ خەییام یەگجار زۆرن و ، بژارکردن و جیاکردنەوەی شیعرە رەسەنەکانی چەندین باس و لێکۆڵینەوەی بابەتیانەو قووڵی گەرەکە، بەڵام ئاخۆ دەشێت تێهزرانی شاعیرو فەیلەسووفێکی مەزن مینا خەییام لە قاڵب بدرێت و، بە چێوەی بازنەیەکی تەنگ سنووردار بکرێت ، کە یەك ناڤەرۆك بەسەریا زاڵبێت ، واتە بە ئەبیکۆڕی یا سۆفی یان نەزانمکار (نەزانینرەو)، یا..یاخود...وەسف بکرێت؟!

بێ گومان ئەم جۆرە لەقاڵبدانە نەك هەر نکۆڵیکردنە لە رەوتی پەرەسەندنی خەییام مینا ئینسان و هزرڤان و زانا وشاعیر ، بگرە جمەبڕین و گچکەکردن و گرگن کردنێشیەتی ! کە بەداخەوە صادقی هیدایت و ئەحمەد حامد صەڕڕاف و عەبدولحەق

فازڵ و ئیحسان ڕەبەری (١٩١٦- ١٩٨٩) خەییامیان بە کافر و زەندیق و باتنی زانیــوەو ، عــەبباس کــەیوان بــە ســۆفی زانیــوەو، زۆری مینــاکی ئەمانــە ، تــاك ڕەهەندانــە خەییامیان لە قاڵب داوە!

هەڵبەتە هەموو چوارینەکانی خەییام لە یەك ئاستدا نین، هەورازو نشێویان هەس و، جیاوازیش لە نێوان ناوەڕۆکەکانیان هەیــە ، بــەپێی قۆناخــەکانی تەمــەنی خــەییام و بابەتەکانیان ، بۆیەش مەزنترین هەڵە ئەوەیە ئەگەر خەییام وەك بوونەوەرێکی نــەگۆڕ لە قاڵب بدەین ، چمان لە زارۆکییەوە تا پیریی و مردنــی هــەمان بوونــەوەری نــەگۆڕ بووەو، هیچ گۆڕانکارییەکی جەستەیی و دەروونی و هزرییانەی بەسەرا نەهاتبێ !

بــا بــزانین باســکاری نــاودار **بەهائــەددین خوڕەمشــاهی** چــۆن باســی دژواری وئاڵۆزییەکانی ناوبردنی شەراب و دڵبەر لە چوارینەکانی خەییامدا دەکا :

" ئەگەر ئەو ئاماژە و ناڤەڕۆکە خەییامیانەی دەربارەی بــادەو ستایشــی مەســتیی و فەرامۆشکردنی جیهان ، لە چوارینەکانی خەییامدا بەمانا ڕاستەقینەکەی وەربگیرێت ، ئەوا خەییامی هزرڤان و فەیلەسووف و ماتماتیکزانی پایە بەرزو قوتابی ئیبن ســینا (بەمەزەندەو پەیڕەوکاری فەلسەفەکەی بــەدڵنیایی) مینــاك کابرایــەکی خەمســاردی کەمتەرخم و ئالوودەی بادە و پەتیارە و هەوەسباز و لەزەتخواز و، کات و کارو تەمەن کوژ دێتەبەرچاو !

خۆ لەشیعری حافزیشدا ئاماژەیێن زۆر بۆ بادە و عەیشونۆش و سترانبێژ و وەسفی مەی ومەیخانان هەیــە ، بــەڵام کــە لــە شــیعری ئــەم دوانــە قووڵببینــەوە ، بۆمــان دەردەکەوێ کە ئەو بادە و شەرابەی ئــەوان ستایشــی دەکــەن و، دەیکــەن بەتــەوەرەی گەلێك لە ناڤەڕۆك ومانای قووڵ ، شەرابی ترێ نیە، بەڵکو بە گوزارشــتی نووســەری

ئەم چەند دێڕە (لە لێکۆڵینەوەی بەرهەمێن حافز) دا بادەیەکی وێژەڤانییە ، واتە بادەیەکی رووتەڵگەرایی و ئەستاتیکی هونەرییە و، هونەر ئافرێنە "

لە بەرسڤی ئەم پرسیارەش :

" بۆچی خەییام وحافزو شاعیرانی دیکە جەختیان لەسەر بادە و دڵبەر کردووە؟ "

خوڕەمشاهی ئێژێ :

" ئەو هزرڤانە هونەرمەندانە یا ئەو هونەرمەندە هزرڤانانە ، ئەگەر لە ئەهلی سەرکێشیی و گومڕاهیی نەبوونە ، لە هەمان کاتیشدا جاڕچی زوهد نەبوونە ، بگرە نەیانویستووە باسی پەرستن و دینداری بکەن میناك : ناصر خوسرەو و ئیبن یەمین ، وەلێ ئەو وێژەڤانە هونەرمەندانە بایەخیان بە بەها ئەستاتیکییەکانی بادە و دڵبەر و سترانبێژ داوە و، لە هەواداران‌ی هونەر بۆ هەنەر بوونە و، قەدری شیعریان لەوە پێ بەرزتر بووە کە بۆ مەرام و مەبەستێن غەیرە هونەری بێگار بکرێ و بەکار ببرێ ، ئەگەر ئەو مەبەستە ئەخلاقیش بێت "

**لێرەشدا پێویستە راستییەکی زۆر زەق بخەینەڕوو ، کە خەییام تەنیا شاعیر نەبووە لە ناوهێنانی (مەی) و(دڵبەر) دا ، بگرە زۆرینەی شاعیرانی ئێران وەهایان کردووە ، تەنانەت سۆفی و عاریفە گەورە بەناوبانگەکان میناك : سەنائی و عەتتار ، کەچی بە رێسای " بانێکە و دوو هەوا " وەل خەییامدا سەودادەکرێ !**

**بۆ نموونە (سەنائی غەزنەوی) ئێژێ :**

" می بر کف گیر و هردو عالم بفروش
بیهوده مدار هردو عالم بخروش
گر هردو جهان نباشدت در فرمان
در دوزخ مست به که در خلد بهوش"

**واتە :**

" مەی بــەدەست وەرگرەو هــەردوو جیهان بفرۆش
ناهــومێد مەوەستەو هــەردوو جیهان بخــرۆشێــنە
گەر هەردوو جیهان ملکەچی فــەرمــانــت نــەبــن
لە دۆزەخا مەست بی باشترە لە بەهەشتا بەهۆش!"

**(عەتتاری نیشابووری) یش ئێژێ :**

"خون شــد جگرم بیار جام ای ســـاقی
کاین جهــان دم است و دم ای ســـاقی
می ده که گذشت عمر و بگذاشتەگیر
روزی دو سە نیز والســـلام ای ساقی"

**واتە :**

"جــەرگــم بــۆتە خوێــن جامــم بــدەرێ ئــەی ســـــاقی
کـــە ئــەم جیــهانــە دەلــیــڤــە و داوە ئــەی ســـــاقی
مەییم بەرێ کە تەمەن گوزەشت و گوزەشــتەڕەو بگرە
رۆژێــك دوو ســێی تریش ئیــنجا ماڵئاوا ئەی ساقی "

بەڕای **گولپینارلی** خەییامناسی تورك چوارینە مەیئامێزەکانی خەییام بە شەتەحاتە ، بۆیەش دەپرسێ : " دەنا چۆن خەییام دەیتوانی بگاتە ئەو پلەو پایە مەزنە لە حیکمت و فەلسەفە و زانست و ئەدەبیاتدا، ئەگەر خوومەندی مەی ئالوودە و بەدمەست بوایە ؟ ! بگرە چۆن دەیتوانی لەو جڤاتە ئیسلامییە ئەو هەموو سیفات و نازناوە گەورانە وەدەستبێنێ ؟ ! (...) ئێمە ناڵێین کە خەییام هەرگیز مەیی

نەنۆشیوە و، مەبەستی لە وشەی مەی عیشقی سەرمەدی و فەیزی رەببانییە ، بەڵام زۆر روونە کە نێزەی هێرشی ئاراستەی زوهدبازانی چاپلووس کردووە ، بۆیە دەبێ زۆربەی چوارینەکانی لەم روانگەوە داوەری بکرێ و، بەخۆی وتوویەتی :

"خـمـار بـه بـوی آب انـگـور شدن
به ازآنکه بەزهد خویش مغرور شدن"
مەســـتبـوون بە بـۆنی ئـاوی تـرێ
باشـترە لە فرِناخیی بە زوهدی خۆوە

ئا ئەمەش گوتەیەکی هەقی یەکێکە لە پاچقەوانە رۆژئاواییەکان ، کـە بەویـژدان و ئینسافەوە باسی خەییامی کردووە (بە ناوکۆی وەدیع بوستانی) یەوە :

**" خەییام بە فراوانی زانست وزانیاری وشارەزاییەکەیەوە ، موسڵمانێکی ئازادە هزر بووە لە کۆت و بەندی دابونەریتی پاشکەوتوو ، زۆر بوێرو ئازا بووە لـە دەربـڕینی راشکاوانەی بیروباوەڕی خۆی کە دگەڵ (مەعقوول) دا یەکانگیر بووە ، گەرچی لەگەڵ (مەنقوول) دا نەگونجاوە ، وەکو زۆربەی هەرەزۆری زانایانی مەسیحی ئەمڕۆکە ، کە مکووم دژی پیاوانی ئایینی دەجەنگێن و، سەرانی رووحانی بە رەخنە و سەرزەنشت تیرباران دەکەن "**

خۆ ئەگەر هەندێك کەس قایل بە راو بۆچوونی ئەم وەرگێڕە بیانییە قایل نەبن ، ئەمە یەکێکە لە زاناو حەکیمانی هاوچەرخی ئێران ، کە **ئایەتوڵڵا سەیید حەسەن رەفیعی قەزوێنی** یە راشکاوانە و ئاشکرا رایگەیاندووە ، کە خەییام گەورەترین زاناو فەیلەسووفی موسڵمانە . هەڵبەتە ئەم گوتەیە لەلایەن زانایەکی گەورەی وەك قەزوێنی نیشانەو بەڵگەی بوێرییەکی هزرانەی دەگمەنە !

*

مامۆستا (**یاحەققی**) دەربارەی کاریگـەریی پێشـینان لـەڕووی شـیعری وهزریـەوە لەسەر خەییام دەڵێ : " بێ گومان خەییام لە کاریگـەریی پێشـینانی خـۆی بـەدوور نەبووە، چونکە شیعری فارسی لەرووی مێژووییەوە ئەڵقەیێن پەیوەستەی یەك زنجیرەن، بۆیە گومان لەوەدا نیە کە خەییام لەژێر کاریگەریی ئەوانەی پێش خۆیـدا بووبێـت ، نـەمازە (فیردەوسـی) هەڵبەتـە شـیعری خـەییام درێـژەی شـیعری فیردەوسـییە لـە پۆشاکێکی ترو زمانێکی تردا، هەروەها لە کاریگەریی (روودەکی سـەمەرقەندی) ش بەدوور نەبووە . ئەم سێ شاعیرە و هەندێکی دیکە لە هاومەشرەبانی هزرییـان ، بـە پێشەنگ و رەواجدەری کەلتووریکی تایبەتی دەژمێردرێن ، کە بەدرێژایی رۆژگارانێك لە رەواج و برەودا بووە..."

لە پەراوێز و دەهمەنێن بەندە بۆ چوارینە پاچڤەکراوەکاندا لـە (دیـوانی خـەییام بـە کوردی) روونبەبێتەوە ، کە خەییام باندۆرباری ئـەم هۆزانڤانانـە بـووە : فیردەوسـی ، شەهید بەلخی ، روودەکـی سـەمەرقەندی ، فـورڕەخی سیسـتانی ، عونصـری ، بابـا تـاهیری هەمـەدانی ، ناصـر خوسـرەو ، عەسـجەدی ، مەعـەڕڕی و ئـیبن شـبلی بەغدادی... هەر بۆ نموونە وەرگێڕ و پاچڤەوان **عەبدولحەق فازڵ** لە پەڕتووکی (شۆڕشی خەییام) دا دەوروبەری (١٤٠ شوێن) ی باندۆری هۆزانی مەعەڕڕی لە (٣٨١ چوارینە)ی دراوەپاڵی خەییامـدا دەسنیشـانکردووە ! بگـرە دکتـۆرە **تەغریـد زەعیمیـان** تێـزی دکتۆراکەی بۆ بەراوردی فەلسەفی لە نێوان مەعەڕڕی و خەییامدا تەرخانکردووە.

جا نەك هەر ئەوەندەو بەس، بگرە هزری خەییام رەگاژۆیە لە قـووڵایی میتۆلۆجیـاو ئایین و فەلسەفە دێرینەکاندا (ئێرانی ، میزۆبۆتـامی ، هنـدی ، میسـری ، یۆنـانی

وعەرەبی) و تەنانەت لە داستانی گلگامیش و پاپیرۆسی میسری (ئاوازێن عـوودژەن) و فەلسەفەی (لکیاتا) و(چارواك) ی هیندی و فەلسەفەییێن (دیمۆکریتیس ، ئەبیکۆڕ ، شیشرۆن و ئەفلۆتین...) دا تا دەگاتە ئایینەکان بە کتێبە پیرۆزەکانیانـەوە نەخاسمـە : ئاڤێستا ، تەورات ، ئینجیل و قورئان . هەروەها فەلسـەفەی ئـیبن سـیناو ئیخوانـو لصەفا...

هەر لیرەشدا پێویستە جەخت لەسەر ئەو نزیکایەتییە بەتینە بەرچـاوە بکرێـت کـە لەنێوان فەلسەفەی مەشائی و سۆفییەت و، لەنێوان سۆفییەت وئیسـماعیلییە ، کـە ئیبن سینا (مامۆستای بەرجەستەی خەییام) هەر سێ ڕێبازەکەی پێکڤە کۆکردبووەوە و گرتبووەبەر.

مەبەستم لەمەدا جەختکردنە لەسەر کاریگەری هزرییانەی پێشینان لەسەر خەییام ، نەك لەڕووی وردەکاری وچۆنیەتی هونـەری شـیعرییەوە . جـا هەڵبەتـە خـەییامیش هەمان (کاریگەریی هزری) بەسەر پاشـینانی خۆیـەوە هـەبووە ، نـەك هـەر لەسـەر ئەوانەی چوارینانیان هۆنیوەتەوە ، بگرە لەسەر ئەوانـەش کـە مەسنـەوەی و چـامەو غـەزەلیشیان هۆنیوەتەوە...**دکتۆر یاحەققی** لەسەر کاریگەریی گشتی خەییام دەڕوات و دەڵێ :

"...خەییام لەوە دەرچووە کە تاقە کەسێك بێت بـەناوی عومـەری کـوڕی ئیـبراهیم خەییامی نیشابووری یەوە لە شیعری خۆیـدا ، چـونکە دەشـێت بـەڕەوتێکی هـزری دابنرێت کە بەدرێژایی سەدەکانی رابردوو بـەزەبری تێهزرینـی ئـازاد و روانگەیـەکی کراوەی بەرزدا لە سەوداکردندا لەگـەڵ پـرس و دۆزە گرنگەکانـدا دژی بزاڤـی هـزری دەسەڵات بەدرێژایی سەدە رابردووەکان، بۆیەش ئەوانـەی هـاوهزری خـەییام بـوون ، هزری خۆیان پتر لە قاڵبی چوارینەدا داڕشـتووەو پاشـان چـوارینەکانیان داوەتـە پـاڵ

خەییام ، یان خەڵکانێکی تر داویانەتــە پــاڵی . هــەر بۆیــەش باوەڕمــان بــە ڕەوتــی خەییامی هەیە ، نەك بە تاکە کەسێك ناوی عومەری خەییامە ! "

**یاحەققی** وای بۆدەچێ کە زۆر شــاعیر لــەژێر کاریگــەریی هــزری بــەتین و بنجــبڕی خەییامدا چوارینەیان بە هەمان ناڤەڕۆك هۆنیوەتەوە و، ناویان فەرامۆش بووە و، ئەو چوارینانە دراونەتە پاڵ خەییام " بۆیەش " پتر لە دەهــەزار چــوارینە دراونەتــە پــاڵ خەییام ! بەڵام ناتوانین بەدڵنیاییەوە دەیەکی ئەو ژمارەیە بەهی ئەو بزانین "

پەیجۆری زەبــردار **خوڕەمشــاهی** لــە گشــتگیریی (ڕەوتــی خــەییام) تێدەپــەڕێت و، کاریگەریی خەییام بەسەر دوو نموونەی بەرزەوە دەستنیشان دەکات و ئێژێ : " شبلی نوعمانی لە کتێبی (شیعری عەجەم) دا دەربارەی حافز دەڵــێ کــە فەلســەفەی حــافز درێژەپێدانی فەلسەفە و شێوازی خەییامە" واتە حافزِ " شرۆڤەکارو میراتگری خەییام و، شۆنهەڵگری هزری خەییامە ، لەگەڵ ئەو جیاوازییەی کە هۆزانی حافزِ مکــوومترە لە هۆزانی خەییام " ئەم ڕاستییەش بەسووکە ڕامان و وردبوونەوەیەك لە دەســتپێکی چەندین غەزەلی حافزدا دەردەکەێت ، کە بریتییە لە سووڕخواردن لە بوورینی تەمــەن و ترس لە ئاکامی فەوتانی جوانی و، مەرگی ئینســان و، بانگــەواز بــۆ قۆســتنەوەی دەرفەتە هەڵکەوتەکانی تەمەن و، پەنابردنە بەر بادە بــۆ فەرامۆشــکردنی ڕاســتییە تاڵەکان ، جگە لە بیرهێنانەوەی شکۆی ئەفسانەیی و ڕاستەقینەی ڕابردووی ئێــران و ڕەمزەکانی ڕۆژگارێن پادشایان : جەمشید و قوباد...

خەییام ئیماندارێکی گەورە بووەو، باوەڕی بە خودا هەبووە ، بەڵام بــاوەڕی حــافزِی شیرازی بەحەقیقەت وتەریقەت و شەریعەت لەچاو خەیامدا پتەوترو مکــۆمتر بــووە . ڕۆحی خەییام نائومێد بوو، بەڵام باوەڕی بە یەکتایی خودا هەبووە . کەچی خەییام لە تێکوفرانی زانایان (فەقیهان و شــەریعەتکاران) ی ســەردەمی خــۆی و، حوکمڕانــانی

رۆژگاری خۆیشی ، کە پشتیوانیان لە واعیزەکانی خۆیان دەکرد ، دەترسا کە ئـازاری پێ بگەیەنن ، بۆیە بەشێوازیکی دووفاقیی ، روالّەتیی و گونووسیی قسەی دەکـرد و، یەکێك لەوانەی کە زۆر لەژێر کاریگەریی خەییامدا بووە ، عاریف و شاعیری گـەورە فەریدەددین **عەتتاری نیشابووری** یە ، میناك لە **(موختارنامە)** کەیدا دەردەکەوێت .

کەواتە خەییام بەچوارینەکانی کاری کردووەتە سەر زۆر شاعیرو ، هەزاران بـەیتیان لەسەر شێوازو رێبازی ئەو هۆنیوەتەوە ! جا لێـرەدا (جگـە لـەو نموونانـەی کـە لـە پەراوێزێن دیوانی خەییام بە کوردی هاتوون) چەندین نموونەی تر پێشکەش دەکەین :

**جەمالەددین ئەبهەری کورد** (سەدەی ٦ ك= ١٢ ز) ئەم چوارینەیە بەڕادەیەکی بەرچاو باندۆرباری خەییامەو، دراوەتەپاڵ خەییام :

" صـبح است بیا بر می گـلرنگ زنیم
وین شیشەءنام و ننگ بر سنگ زنیم
دسـت از امل دراز خـود بـازکـشـیم
در زلـف نـگار و حـلـقەءچنگ زنیم "

**شێخ سەلام ئەچنەو وەریگێڕاوە :**

"بـــەیـانــە سـاقی شـــەرابی گوڵــڕەنگ
وردی کەین بە بەرد شیشەی نام و نەنگ
دەست لـــە ئـومێـــدی ژاکاو هەڵگرین
بـۆ زوڵـــفـی لـوول و بۆ دامانی چەنگ"

با بزانین **عەتتاری نیشابووری** چۆن چاوی لە خەییام کردووە کە دەڵێ :

" اگر چو رستم شوکت وزورت بود
جـای چـون بـهـرام گـورت بود"

ئەگەر رۆستەم ئاساش هێزو زەبرت هەبێ

هەر میناك بەهرام خاك بە گڵكۆت دەبێ

وەك پێشتر وتوومە كە **عەتتار** هاوشاری خەییام بووە و، زۆر باش ئاگای لە چوارینەكانی بووەو، بگرە بە باندۆریان و لاساییكردنەوەیان دەیان چوارینەی هەڵبەستووە ، كە هەندێكیان زڕەدزین ، كەچی لە (ئیلاهی نامە) كەیدا بە پیاوێكی ناتەواو ناوی خەییامی هێناوە !

ئاری باش روونبۆتەوە كە عەتتار باندۆرباری خەییام بووە و زۆر لاسایی كردۆتەوە و بەرپەرچیشی داوەتەوە ، بۆیە زۆربەی كۆكەرەوەی چوارینان گەلێك چوارینەی عەتتاریان داوەتەپاڵ خەییام و بە پێچەوانەشەوە . ئەمانەش نیوەدێڕە یەكەمەكانی ۳۸ چوارینەی عەتتارن ، كە باندۆری خەییام زۆر زەق و روونە تێیاندا، كەچی ۱۰ چوارینەی دیكەش كە هی خەییامن و بە هەڵە دراونەتەپاڵ عەتتار، لە (دیوانی خەییام بە كوردی) پاچڤەیانمكردووە و ئاماژەشم بە ناوی عەتتار كردووە :

× بر چهرهء گل شبنم نوروز خوش است

× مرد آن باشد كه هر زمان پاكتراست

× ای مرغ عجب ستارگان چینهء تست

× گر جان گویم عاشق آن دیداراست

× هر ذرّه كه در وادی و در كهساریست

× امروز چو من شیفته و مجنون كیست

× یك عاشق پاك و یك دل زنده كجاست

× اجزا و زمین تن خردمندان است

× هر خاك كه در جهان كسی فرسودەاست

× لاله ز رخی چـو ماه میبیـــــنم من
× پیش از من و تو پیر و جوانی بودست
× هر سبزه و گل که از زمین بیرون رست
× مهتاب به نور دامن شب شکافت
× هر روز بر آنم کنم شب توبه
× آنرا که کلیـد مشکلی می باید
× آنها که به کام دل جهان داشتند
× خون دل من که هر دم افزون گردد
× در عشق تو هر دلی که مردانه بود
× دنیا چه کنی که بی وفا خـــواهدبود
× بنگر ز صبا دامن گل چاك شده
× روزی که ز خاك من برون آید خار
× گه خستهء (لن ترانیم) موسی وار
× ای روح تویی به عقل موصوف آخر
× بر آب روان و سبزه ای شمع طراز
× می پرسیدی که چیست این نقش مجاز
× ای مرد رونده مرد بیچاره مباش
× کو دل که بداند نفسی اسرارش
× تا چند حدیث هفت و چار ای ساقی
× چون صبح دمید و دامن شب شد چاك
× تا بر ره خلق می نشینی ای دل

× زهراست غم جهان و مى ترياكم

× هر كوزه كه بيخود به دهان باز نهم

× دل گفت كه ما چو قطرهء مسكنيم

× ترسم كه چو بيش ازين به عالم نرسيم

× روزى كه بود روز هلاك من و تو

× چندان كه نگاه ميكنم هر سوئى

× اى روح در اين عالم غربت چونى

× اى دل چو درين راه خطرناك شوى

پێدەچێ (**خاقانی**) لە چامە بەنێوبانگەکەیدا (**هەیوانی مەداین**) لەژێر باندۆری چوارینەیەکی خەییامدا بووبێت :

" آن قصر كه بر چرخ همى زد پهلو "

ئەو کۆشکەی کە تەنگی بە فەلەك هەڵچنیبوو.

**شێخ مەجدەددین بەغدادی** (م : ؟ ١٢١١ یا ١٢١٧ ز) لە باندۆربارانی خەییامەو، چوارینەکەی :

" گر من بصلاح خويش كوشان بدمى"

ولێنگەی چوارینەکەی خەییامە :

" گر من به مراد و اختيار خودمى"

با بزانین **سیراجەددین قومری** (م: ؟ ١٢٢٧ یا؟ ١٢٤٢ ز) چۆن بەم چوارینەیە خەییامان دێنێتەوەیاد :

" امـروز کـه رونـــق جـــوانی مـن است
می خواهم از آن کـه شـادمانی من است
عیبش مکنید گرچه تلخ است خوش است
تلخ اسـت از آن کـه زنـدگـانـی اســـت "

**واته :**

ئیـمرۆ کـه ڕەونـەقـی گــەنـجیـمه
مــەییم دەوێ کـــه شـادمـــانـیـمه
به نەنگی مەزانه خۆشه گەرچی تاڵه
ئـــاری تـاڵـه چونـکه زیندەگـانیمه

**مەجدەددین هەمگری کورد**(م : ١٢٧٩ ز) بەباندۆری خەییام ئێژێ :

" تـا کـی عـمـرت به خودپرسـتی گَذرد
یـــا در غـــم نیـستی و هستی گَـذرد
آن عــمــر کـه مــرگ باشد اندر پی آن
آن به که به خواب یا به مستی گَذرد"

**به وەرگێڕانی ئەحمەد شاڵی** (١٩٢٤-١٩٧٧) :

"تاکەی خــۆپەرسـت لەپێناوی ژین
هــەر غـەمی بوون و نەبوون بچێژین
سەرخۆشبه عـومرێ ئەنجامی گڵ بێ
چـــاکه به مەستی یا خەو بیکوژین"

پێدەچێ **نیزامەددین ئەصفەهانی (کە پێشتر باسکراوە...)** گەلێك لە چوارینە فارسی و عەرەبییەکانی خۆی لەژێر کاریگەری خەییامدا هۆنیوەتەوە، کەچی وەکو عەتتار لاسایشی کردۆتەوەو رەخنەشی لێ گرتووە !

**فەخرەددین عیراقی کورد (م : ؟ ١٢٨١ ز)** گەرچی شاعیرێکی سۆفی مەشرەب بووە ، باندۆرباری خەییام بووە و، چەند چوارینەیەکی خەییامانەی هەڵبەستووە میناك لەم چوارینەیە ، کە دەدرێتەپاڵ خەییام :

" ابر آمد و دوش برسر سبزه گریست
بی بادهء گلرنگ نمی باید زیست
این سبزه که امروز تماشاگهء ماست
تا سبزهء خاك ما تماشاگهء کیست"

**بە پاچڤەی عەبدوڵڵا گۆران** (١٩٠٤- ١٩٦٢)**:**

" هەور دیسان هات گیای شت بە گریان
بێ مەیی گوڵ رەنگ چۆن بژین یاران؟
ئێستا سەیرانگای ئێمەیە سەوزە
ئەی سەوزەی خاکمان کێی دێتە سەیران؟"

**ئەمەش چوارینەیەکی دیکەی (فەخرەددین عیراقی)یە بە پاچڤەی بەندە خۆم :**

شێخێکی بەدمەست لە مەیخانەوە دەرچوو
پیاڵەی مەی بە دەست و دڵی لەدەستدابوو
دەیگۆ: مەی فڕکە لەم جیهانە چرووکەدا
کەس لە خۆی ئازاد نابێ خینژی مەستبوو

هەروەها **سەعدی شیرازی** (م : ؟ ١٢٩٢ ز) کە دەڵێ :

" چەندین جاری دی (تیر) و(دی) و(ئەردیبەهەشت) دێ

کەچی ئێمە لەژێر خاکدا خاك و خشتین "

" بخاك بر مرو ای آدمی به نخوت و ناز

که زیر پای تو همچون تو آدمیزاداست "

ئادەمیزادۆ! بە ترۆفیزەوە مەڕۆ بەسەر ئەم خاکەیە

چونکە میناکی تۆ ئادەمیزادان لەژێر پێتا هەیە

" عجیب نیست از خاك اگر گل شکفت

که چندین گل اندام در خاك خفـــت "

سەیر نیە ئەگەر گوڵ لە خاکدا بڕسکێ

چونکە چەندین گوڵ ئەندام لە خاکا خەفتووە

" سعدیا دی رفت و فردا همچنان موجود نیست

در میان این و ان فرصت شمارا امروز را "

ئەی سەعدی دوێنێ بوری و سـبەینێش نیە

لە نێوان ئەم و ئەوا دەلیڤەی تۆ هەر ئیمڕۆیە

" داخەکەم ! لە پاشمانا زەمان چەن دەسووڕێتەوە

گوڵ تیێـدا دەڕسکێ و گولیلکان دەپشکێنەوە"

" سەروویەکی بڵند بۆ ئەم گوڵستانە نەهات

مەگەر باهۆزی ئەجەل رەگی هەڵنەکێشێ "

**پووربەهای جامی** (م : ؟ لە نێوان ١٢٧٠ و١٣٣١ ز) ! بانـدۆرباری خـەییام بـووە ، بگرە جارجار نیوەبەیتیشی لێی خواستووە ، وەك لەم چوارینەیەدا ، کـە دەدرێتـەپاڵ خەییام :

در خواب مـرا دوش خـردمـنـدی گـفـت
که خواب گـل نشاط و شـادی نـشکـفـت
چیزی چـه کنی کـه با اجـل باشـد جفـت
"می خور که بسی بەزیر گل خواهی خفت"

**واتە :**

دوێـکـە لە خـــەوما ئـاوەزمـەندێـك پێی وتم
کە لە خەفتنا گوڵی چـالاکی و شادی ناپشکوێ
ئــەرێ ئـــەوە چیــدەکەی کـــە هـــاومەرگە
"مەی بنـۆشـە کە زۆر لەژێـر گـــڵا دەخـەوی"

**لە سەدەی هەفتەمی کۆچیدا (١٢٠٣- ١٣٠٠ ز)** ئامادەڤانیی چـوارینەکانی خـەییام و باندۆری لە دیمەنی شیعرییدا گەییشتۆتە ترۆپك ، بۆ نموونە **سەیفی هورەوی (ل :** ٦٨١ ك = ١٢٨٢ ز) لە (تاریخ نامەی هورات) دا کـە لـە دەورووبـەری (١٣٢١- ١٣٢٨ ز) دا دایناوە ئەم چوارینەیەی تۆمارکردووە ، کە ئاماژەی بۆ حەکیم (واتە خەییام) کردووەو نیوەبەیتێکیشی لێی خواستووە :

از آمــدن بـــهـــار و از رفــتــــن دی
اوراق وجــــود ما هـــمی گـــردد گی
می خور مخور اندوه که گفتەاست حکیم :
" غم های جهان چو زهر و تریاقش می"

**واته :**

بـه هـاتـــنی بـــەهـــارو ڕۆیـــشـتـنی بـــەفـــرانـبار
پەڕەکـانی هەســـتیمـان هەمـــوو پـــێـــچرانــــەوە
مەی بنۆشەوخەفەت مەخۆ، کە (حەکیم) فەرموویەتی:
" خەمەکانی جیهـــان وەك ژەهـــرە و تریـــاقی مەییە"

بۆیەش زۆر لە چوارینەکانی شاعیرانی ئەم سەردەمە بەهۆی نـاوەڕۆکی خەییامییـەوە دراونەتەپاڵ خەییام

هەڵبەتە لە پاژەکانی دیکەی ئـەم پەڕتووکـەدا ئامـاژەکراوە بـۆ چـەندین شـاعیری بانـدۆرباری خـەییام ، چ بـەناوبانگ و، چ گومنـاو ، لێرەشـدا پێویسـتە ئەمانـە بخەینەسەریان :

**ئەسێرەددین ئەومانی** کورد(م : ١٢٥٨ ز) کە ئێژێ :
" ای چرخ ز گردش تو خرسند نیم.."

**نەجیب جرفازقانی** (م : ١٢٦٦ ز) کە ئەڵێ :
"ای دل غم این جهان بیهوده مخور.."
" می خور که بسی زیر گلت باید خفت"

**هەروەساش ئیمام هورەوی** (م : ١٢٦٨ ز)

*

**خاجووی کرمانی** (م : ١٣٥٢ ز) چوارینەی خەییامئاسای هۆنیوەتەوە وەك ئەمە :

"مستان چـو هوای در میخانــه کنند

پیمــان شــکنند و عـزم بتــخانه کنند

کاشــانه به آب چشم ســاغر، گل کن

زان پیش که از گل تو کاشانه کنند"

**واته :**

مــــەستان کــە لــە مەیــخانە تاسەدارن

پەیمان دەشکێنن و روو لە بتخانە دەکەن

ســا یانەت بە ئاوی چاوی پیاڵە بکە گڵ

پــێــش ئــەوەی لــە گـــڵی تۆ یانە بکەن

**عوبێد زاکانی** کورد(م : ١٣٧٠ ز) بەڕادەیەکی سەنجڕاکێش شــەیدای چــوارینەکانی خەییام بووە و لە لاساییکردنەوەیا توندڕە و بووە ، بۆیەش چەند چوارینەی دراوەتەپاڵ خەییام، ئەمەش یەکێکیانە :

دنیــا نە مقــام ماســت نە جای نشست

فرزانــە در او خــراب اولی تــر و مست

بــر آتـــش غــم ز بـــادە آبــی مــی زن

زان پیش کە در خاك روی باد بە دست

**واتە :**

دنیا نە نشینگەی ئیمەیەو نــە یاگەی مانەوەیە

کە ژێــر لــــەم کاولە مەست بێت باشــتر ئەوەیە

ســا بكوژێــنەوە بە مــەی ئـــاگـــری كـۆڤـــان
پێش ئەوەی رووچیتە خاكا وەك با لە دەســـتان

هەڵبەتە **حافزی شیرازی** بە پێی جەختی زۆربەی باسكاران ورەخنەگران پتر لــە هــەر شاعیرێكی دیكە لەژێر كاریگەریی خەییامدا بووە :

" هر وقت خوش كه دست دهد مغتنم شمار
كس را وقوف نیست كه انجام كار چیست "
هەر كاتێكی خۆش بە دەست كەوت بیقۆستەوە
كەس نازانێت كە ئاكام چ دەبێت
" روزی كه چرخ از گل ما كوزەها كند
زنهار كاسەء سر ما پر شراب كن "
رۆژێكیان چەرخ لە گڵمان گۆزەیێن چێدەكا
زینهار كاسەی سەرمان پڕ شەراب بكە
" بە میهرەبانی و نەزاكەت پەرداخ بگرە دەستەوە
چونكە لە كلۆخێن جەمشیدو بەهمەن و قوباد چێكراوە"

**عەبدوڕڕەحمان جامی** (١٤١٤- ١٤٩٢ز) (٢٥٤ چوارینە) ی هەس ، **(١٠)** دانەیان لە خولگەی ناوەڕۆكە خەییامییەكاندا دەسووڕێنەوە میناك ئەم چوارینەیە :

"روزم بــە غم جهان فرســوده گَذشت
شب در هوس بوده و نابوده گَذشـت

عمری کـــه ازو دمی جـهــانی ارزد
القصه، به فکرهای بیهــوده کَذشت"

**واته :**

رۆژم به خەمی جیهانی کـرووچ گوزەشت
شەو به خولیای (هەبوو)(نەبوو) گوزەشت
ئەو تەمەنەی که بیهنێکی جیهانێ دێنێ
بەکورتی،به کەڵکەڵەی بێهووده گوزەشت

**ئەمیر عەلی شیر نەوائی** (١٤٤٠- ١٥٠٠) که (تەخەللوصی) شیعریی بەتورکی **(نەوائی)** و بەفارسی **(فانی)** یه ، له کۆی (**٥٩** چوارینه) ی دیوانه فارسییەکەی ، دەوروبەری (١٠) دانەیان له خولگەی تێهزرانی خەییامدا دەسوورێنەوه ، وەك ئەمانە:

"در جــام بلوریــن می همچــون یاقوت
گــر یابــم سازم شــب و روز آنــرا قوت
تا در فلــك پـــیر و ســـپــهــر فــرتوت
چون هردو شود حواس و عقلم مبهوت "

**واته :**

له جامی بلوورِیندا مەی مینا یاقووت
گەر بۆم بلوێ شـەورۆژ دەیکەمه قووت
تا له پـیره فەلەك و ئاسـمانی فەرتووت
بەشـکو هەسـت و ئاوەزم ببن مەبهووت

" دارم ز وجود خود پریشانی و بس
وز جـمله کردەهـا پشیمانی و بس
از عقل نصـیبم شده نادانی و بس
بـر نادانی خـویش حـیرانی و بس"

**واته :**

له بـوونی خۆما هەر پەرێشانیم هەس
له گشت کردەوەما پەشـیمانی و بەس
له ئـاوەزدا بـەشـم نەزانـیـنـەو بەس
ئەڕای نەزانیـنی خۆم هیدمانـم و بەس

" آگاه نـگشـتم که دریـن دیر کیم
یا خـود چیم و از چیم و بهر چیم
معلـومم نی که آدمی یا زمی یم
یا خاك زمین ز مـن چسان آدمیم"

**واته :**

تێنەگەیشـتم که ئەز لەم سەرایە کیم
یا خود چیم و له چیم و لەپێناو چیـم
ناشـزانم که ئادەمیم یان خۆڵ و گڵم
یا خاکی زەمین لێمە، چۆن ئادەمیم ؟

**ئاصفی** (١٤٧٨- ١٥١٧ ز) بە پێـی چـوونگەی دکتـۆر زەبیحـوڵڵا صـەفا (١٩١١- ١٩٩٩) : " لە زۆربەی چوارینەکانیا هەوڵیداوە پەیڕەوی چوونگەی تێهـزرینی خـەییام بکات..."

بۆ نموونە :

دوران حـیات ما عجـــب می کَـذرد
بــرخیـز کـه دوران طـرب می کَـذرد
در جام طـرب ز باده ریـز آب حیات
کز عمر تو روز رفت و شب می کَذرد

**واتە :**

خـــولی ژیــانمــان بە سەیروسەمەرە دەڕوا
هــەڵــە ئەوەتـانێ خـولی کەیـــف دەڕوا
ئاوی ژیان لە مەیەوە بڕێژە جامی خۆشی
کە ڕۆژ لە تەمنت چوو، وا شەویش دەڕوا

**هیلالـی جوغتـائی** (م : ؟ ١٥٢٩) لـە کـۆی (٣٥ چـوارینە) دوو- سـێیەکیان لـە خولگەی جیهانبینیی خەییامدا دەسووڕێنەوە میناك ئەم چوارینەیە :

در عـــالم بـی وفـا کـــس خـرّم نیست
شـــادی و نـشـاط در بـنی آدم نیست
آن کس که درین زمانه اورا غم نیست
یـــا آدم نیست یـــا ازین عالـم نیست

**واته :**

لەم دنیــای ئەمەکســزە کەس شــادمان نیە
شــادی ونەشەو گەشە ئەڕای ئادەمیزاد نیە
ئەو کەسەی لەم زەمانەدا خــم و هەمی نیە
یان ئادەمیــزاد نیــە یــا لەم جیهــانەدا نیە

**ئەهلی شیرازی** (١٤٥٤- ١٥٣٦ ز) چوونگەی خەییامی گرتۆتەبەر بە ڕادەیــەك کــە چەند چوارینەیەکی دراوەتەپاڵ خەییام ، میناك :

" ساقی گل و سبزە بس طـربناك شــدەاست
دریاب کــە هــفتــە دگــر خــاك شــدەاست
مــی نــوش و گــلی بــچین کە تا درنــگری
گل خاك شدەاست و سبزە خاشاك شدەاست"

**بە پاچڤەی شێخ سەلام :**

" ســاقی ! سەوزەگیــاو گوڵ تێــك ئــالاّوە
تــێــپــەڕی بـــەهار حــەوت ڕۆژی مــاوە
شــەراب بــنــۆشــە ســـبحەی ئەبیـــنی
گوڵ ، خاك ، گیا، دڕك ، سەبزە فەوتاوە"

**سەحابی ئەسترابادی** کورد (م : ١٦٠١ ز) کە بــە چــوونگەی عیرفــانی و فەلســەفی ناسراوە، بەپێی پشکنینی مامۆستا **هومایی** لــە زۆر چــوارینانــدا پــەیڕەوی شــێوازی چوارینەکانی خەییامی کردووە ، بۆیەش چەندین چوارینەی دراونەتەپاڵ خەییام .

**شێخ بەهائەددین عاملی** (م : ١٦٢٢ ز) ماتماتیکزان ، گەردوونناس و ئەدیب . بە فارسـی و عـەرەبی چـوارینەی هۆنیوەتـەوە و، لـە(٨١ چـوارینە)ی فارسـیدا چـوار-پێنجێکیـان بانـدۆری خـەییامیان پێـوە دیـارە . هـەژی ئاماژەیـە کـە شـێخ بـەها چوارینەیەکی خەییامی وەرگێڕاوەتە عەرەبی ، ئەمەش چـوارینەیەکی خەییامیانـەی وییە:

" در میکـده دوش زاهـدی دیدم مست
تسبیح به گـردن و صـراحی در دست
گفـتم ز چه در میکده جا کردی گفت:
از میکده هم به سوی حق راهی هست"

**واتە :**

لە مـەیخانەدا دوێـشـەو زاهـدێـکم دی
تەزبیح لە ملی و سـوراحـی بە دەسـتی
گـوتـم ئەریٚ لە مەیخانە چ دەکەی؟ وتی:
لە مەیخانەش بەرەو حەق رێچکەیە دەبی

**تالب ئامولی** (م : ١٦٢٦ ز) لە هۆنینەوەی چوارینەدا خۆی بە خەییامی سەردەمی خۆی زانیوەو، بەشانازییەوە ئێژیٚ :

" به قطعه و غزلم انوری و سعدی دان
به مثنوی و رباعی سنایی و خیام"

ئەمەش **صائب تەبریزی** (؟ ١٦٠٧- ؟ ١٦٧٥) کە بە بەیتێك نموونەیەکی زۆر نایاب لـە باندۆری خەییامان دەداتیٚ :

" از بیابان عدم تا سر بازار وجود
بتلاش کفنی ىٚمد عریانی چند"
- له بیابانی نیستییەوە تا بازاڕی هەستی
رووتەڵانێکی زۆر بەتەمای کفن هاتوونە ! "

پاش گەشتەکەمان لە گوڵستانی شیعری فارسی کۆندا بۆ زانینی ئامادەگی و باندۆری چوارینەکانی خەییام ، با بزانین **یەغما جەندەقی** (م : ١٨٥٩) شاعیری حەنەکچی بەناوبانگ چی ئەڵێ :

" خیّام کە داشت پیشی از ما قدمی
از می نکَذاشت در جهان بیش و کمی
هم پیش از ما بدان جهان شد ترسم
در خلد برین نماند از باده نمی ! "

**واتە :**

خەییام کە هەر پێشتر پێشەنگمان بووە
زۆرو کەمی لە بادەی جیهانا نەهێشتووە
ئەترسم لەو جیهانانیشا هەر پێشمانکەوێتەوە
چۆرێکی بادە لە بەهەشتی بەرینا بۆمان نەمێنێتەوە!

*

**ئینجا با سووکە ئاوڕێك بدەینەوە لە باندۆری چوارینەکانی خەییام لە شیعری نوێی فارسیدا :**

**فەڕڕوخی یەزدی** (١٨٨٩– ١٩٣٨) لە کۆی (٣٨٤ چوارینە) یا نزیکەی بیست چوارینەی سەرنجی راکێشام ، کە لە خولگەی ناڤەڕۆکە خەییامییەکاندا دەسوورێنەوە ، بەلاّم نەك بە لاساییکردنەوەیەکی ئاساییانە ، بەلکو بە چوونگەیەکی هزرانەی شۆڕشئامێزیی هاومێژانە ، میناك ئەم چوارینانە ، کە فلیڤانیی **یەزدیان** تێدا دەردەکەڤێ :

اســرار ســراچهء کهن تازه نبود
غـوغای حیـات غـیر آوازه نـبود
این جامــهء زندگی که خیّـاط ازل
ازبهر من و تو دوخت اندازه نبود

**واته :**

رازگـەلی ئەم سەرا کـۆنەیە تازە نەبوو
ژاوەژاوی ژیـان خینژی گوتگوتك نەبوو
ئـەم پۆشـاکی ژیانە کە خەیاتی ئەزەل
بۆ من و تـۆی دووری بە ئەندازە نەبوو

*

چــون عـیــش وغـم زمانه قسمت کردند
مــارا غــم بـیـکـرانــه قسـمت کردند
شـیخ و شــه و شحنه عیش و نوش همەرا
بـردنـد و بـرادرانـه قـســمـت کـردنــد

**واته :**

گاڤا شادی و خەمی دنیایان دابەشکرد
خەمی بێپایانیان بە ئێمە بەخشی
شێخ و شاو شەحنە تەڤ عەیشونۆشیان
بۆ خۆیان بردو برایانە دابەشیان کرد

❋

گر شیخ ریا رند قدح نوش نبود
گر شحنهٔ شهر مست و مدهوش نبود
یك شمّه ز بی مهری او می گفتم
گر مُهر مرا بر لب خاموش نبود

**واته :**

گەر شێخی ریاباز رەندی بادەنۆش نەبایە
گەر ئاژانی شار مەست و بێهۆش نەبایە
کەمێك لە بێ میهرەبانییانم دەردەبڕی
گەر مۆر لێوانمی خامۆش نەکردبایە

❋

برخیز که تا بادهٔ گلرنگ زنیم
بنشین که ز شور چنگ بر چنگ زنیم
چون دلشکنی کار ریاکان است
بر شیشهٔ سالوس و ریا سنگ زنیم

**واتە :**

هـەڵسە با بـادەی گـوڵـڕەنگ بنـۆشـین
دابـنـیشـین و بـەجـۆش چەنـگ بـژەنین
چونـکە تێکشکاندنی دڵ کاری ریابازانە
با بەرد لە شووشەی ریاوسالۆسی تێگرین

❊

هر سر کە بە پای خم می سودەنشد
از دست غـم زمـانە آسـودە نشد
هر دامن پاکی کە بە می شد رنگین
بـا آن هـمـە آلـودگی آلـودە نـشد

**واتە :**

هەر سەرێ لەکن کووپەی مەی ئاسوودەنەبێ
لـە چنـگی خـەمی زەمـانە ئاسـوودەنابێ
هـەر داوێـنیکی پاك کە بە مەی دەڕەنـگێ
هـەرگیـز بەو هەموو لەوتـاندنەوە نالەوتێ

ئینجا با بزانین **حوسێن قودسی نەخەعی** (١٨٩٤- ١٩٧٧) کە پتر لە هەموو شاعیرانی چوارینەبێژی سەدەی بیستەم بانـدۆرباری چـوارینەکانی خەییامـە، چـۆن فەلسـەفەی خەییامی مامۆستای بە نەختی و پوختی دەردبڕێ :

"من هەمیشە باوەڕم وابووە ، کە بابەتی دڵخۆشی باشترین دەستکەوتی بەوە ئـەبێ کە وردبینەوە لەو راستییەی ، کە ناگۆڕێت و لەم شـیعرانەدا باسـیان کـراوە . وەکـو

ئەوەی کە ئاشکرایە ئێمە لەسەر زەمینین ، بەڵام بۆ ماوەیەکی کورت و کەم و ئەو کاتەی کە تێئەپەڕێت جارێکی تر ناگەڕێتەوە . کەواتە خەفەت و ئاخ و داخ و خودپەسندی بۆ چیە ؟ دڵخۆش بەو وابکە کە خەڵکیش دڵخۆش بن . ئەم فەلسەفەی عومەر خییامە لە هەزار ساڵ لەمەوەبەرەوە ، ساغبۆتەوە کە زۆر راست و تەواوە"
بەپێی پاچڤەی شێخ سەلام (١٨٩٢- ١٩٥٩) کە چوارینەکانی (**نەخەعی**) زۆر جوان وەرگێڕاوەتە کوردی و، ئەمانەش چەند میناکێکن :

زەمانە زەهـر پـڕ پیاڵە ئەکا
لەگەڵ تارو عوود دەرخواردت ئەدا
ئەسکەندەر، جەنگیز، قوبادو ضحاك
بە پەنجەی ئەجەل مردن وەك گەدا

❊

هیچ کاتێ گرێی دڵ نەکرایەوە
هەر کەسێ کە رۆی نەگەڕایەوە
زەنگی خەتەرم لێدا سەد کەڕەت
وەك قاپی ئەلحەد بێ دەنگ مایەوە

❊

یەك گۆزە شەراب لەسەر قەبری یار
چەن پیاڵەم خواردۆ من بە یادگار
وتم بە گۆزە: ئەم گۆشتەی ئێمە
رۆژێ پڕ شەراب دێ بۆ سەر مەزار

❊

گـیرام مــردووان هەم زیندوو ئەبوون
ســەد هــەزاران جار ئەهاتن ئەچوون
کەلکی چی ئەگرێ هەر وەکو ئێستە
بــە زاری ژیــن و هــاتــن و دەرچوون

❊

ئەو گــەردە لەسەر گــەڵای درەختە
زەڕەی رزیـــــوی عاشـقی سەخـتە
ئەو تــۆزە لە دەشت با ئەیخاتە باخ
پادشـاهێـکی بێ تـــــاج و تەختە

❊

پیـاڵـەی مەی وەك جامی جەم وایە
دنـیاو سـورشـــتی سەراســەر تیایە
شـاخ و دەشت و کێو چیمەن و چیـا
پــڕ لــە ئەگریــجــەو خــاڵ و گــۆنایە

❊

ئەو قەسرە ئەوسا نووسرا لە دەفتەر
ئیــمڕۆ کــەلاوەی کـاوولــەو بێ فەڕ
گــەڕایــن بـۆ ئێــمە جیانــەکرایــەوە
بەردی بنـچـینە و کاکیلەی قەیسەر

**نیما یوشیج** (١٨٩٧- ١٩٥٩) پێشەنگی نوێخوازی شیعری فارسی هاومێژ لە کۆی (٥٩١ چوارینە) دا ناوەڕۆکی نزیکەی (٤٠) دانەیان پەیوەندی بەتینی بە تێهزرینی خەییامەوە هەس ، میناك ئەم چەند دانەیە :

یك راه ندیـدیـم كه خـود باز نبود
یك نقطه به پایان كه هم آغاز نبود
رفتیم بسـی ره به بیـابان افسـوس
حـرفـی كه شـنیـدیـم جز آواز نبود

**واتە :**

یەك رێگەمان نەدی کـە بەخـۆی واز نەبێ
خـاڵـێـك لە پایـانا کە هـەم سەرەتا نەبێ
لە بیاباندا رێگایانی زۆرمان پەیکرد پەکوو
ئەو وتەیە کە بیسـتمان خینژی ئاواز نەبوو

❋

جستیم ز جـرم خـاك تا كنـه وجود
بس از پس پرده، پرده بر ما بگشود
آن بحـر مـحـیـط كه با گـردش مـا
نـه هـیچ از آن كاست نه بر آن افزود

**واتە :**

له گـۆی خاکەوه تا ناخی بـوون گـەڕاین
پەردە ئاوەڵا بوو، نهێـنییێـن زۆر خویابوو
کەچـی دەریای دۆرانـدۆر بە گـەردشـمان
نە هیچ لێی کەمبوو نە هیچیشی زیادبوو

❋

کـردم زبـر و زیر همه راه وجود
چشم دل من نه هیچ یکدم آسود
گر چند به فرسنگ شدم راه دراز
باز آمدم آخر به همان راه که بود

**واتە :**

گشت رێگایانی هەسـتیم سـەروژێـرکرد
کەچی چاوی دڵم تاوێك ئاسـوودە نەبۆوە
گەر چەند بە فرسەنگ رێی دریژم تەیکرد
هەمدیـس بـۆ هەمان رێی جاران هاتمەوە

❋

گــویــند بریـم اگــر نـظـر در مــوجود
بودەاسـت چـو نابوده و نابوده چـه بود
امـا سـخن ای بـــرادر! از بودن ماست
این هیمه چـو می سوزد، می دارد دود

**واته :**

پێمان ئێژن گەر لە بوونەوەر تێرامێنین
هەبوو میناك نەبووە، ئەی نەبوو چییە؟
وەلێ بڕاڵە باس باسی بوونی ئێمەیە
ئەم چیلکە کە دەسوزێ و دووکەڵی هەیە!

*

آمد بسوی مسجد زاهد مردی
وآمد به سوی میکده می پروردی
این جام همی گرفت و آن نوحه به کف
هردو ز پی خلاص جان از دردی

**واته :**

پیاوێکی هەبیس بەرەو مزگەوتێ هات
بەرەو مەیخانەش مەیپەروەرێ هات
ئەمە جامی هەڵئەداو ئەوە بە چەمەری
هەردو بۆ رەهای گیان لە چەرمەسەری

هەر لێرەشدا پێویستە ئاماژە بۆ چامەیەکی درێژی فرەیدوون موشیری (١٩٢٥-٢٠٠٠) بکەم ، کە(١٣٥ دێڕ) ە و بە سەرناڤی (خیام ، پیام آوری بیداری = خەییام پەیامهێنەری بێداریی) هەڵبەتە باندۆری خەییام تێدا زۆر روونە ، بەڕادەی خواستەی هەفت چوارینەو چەند نیوەبەیتی خەییام ، بۆیەش بۆ زمانێن کوردی و عەربی پاچڤەمکردووە ، لێ لەبەر درێژیی بیاڤی بڵاوکردنەوەی لێرەدا نەبوو.

هەرئەچنەو دەبێ ئاماژە بۆ بەرهەمێکی شیعریی عەلی جەعفەری (ل : ١٩٤٤) بکـەم بە سەرناڤی (چنین گفت خیام = خەییام ئەچنەو وتی) کە لە (٧٧ پارچـە) پێکهـاتووە (دەوروبەری ١٣٠ لاپەڕەیە) کـە جەعفـەری هۆزانڤـان خـەییامی کردۆتـە دەمـامکی هونەری بۆ دەربڕینی هەڵوێستی لە ئێرەنگەدا.

داخەکەم لێرەدا بیافی ئەوەم نیە باسی باندۆری خـەییام لەسـەر هـۆزانین هۆزانڤـانێن تاجیکستان و ئەفغانستان بکەم ، وەلێ هەرنەبێ دەبێ ئاماژە بۆ هۆزانڤانی گـەورەی تاجیك لایق شیرعەلی (١٩٤١- ٢٠٠٠) بکەم کە لە تاجیکستاندا بە (خەییامی دووەم) بەناڤودەنگە و، نزیکە (٣٠٠ چوارینە) ی لە خولگەی هزرانەی خەییامدا هەڵبەستووە بە سەرناڤی (جام خیام = جامی خەییام) ، بگرە چەند چامەیەکیشی دەبارەی خەییام میناك: (خیام در قعر اقیانوس = خەییام لـەبنی زەریالووشـدا) و (گورسـتان خـیرە= گۆڕستانی خەیرە) و (واپسین نفـس خیـام = دوایـەمین هەناسـەی خـەییام) ئەمـەش مشتێکە لە خەرواری (جامی خەییام) ی شیرعەلی :

جامی و بتی و عاشقی خـوش حـالیـست
سالی کە گَذشت با خوشی خوش سالیست
خـیـام! بـە هـر زمانـــە در بـــزم خـــرد
جـام تـو پراسـت، لیك جایت خـالیـست

**واتە :**

جامێـك و یارێـك و عاشقێـك، خۆشحاڵییە
ساڵێك بەخـۆشی گوزەشـت، خۆش سـاڵییە
خەییام! لە هەر زەمانێك لـە بەزمی ئاوەزدا
جـــامی تـۆ پـڕە، بـەڵام شـوێـنت خاڵییە

*

خیـــام! دلـــت از دل ما آگـــاه‌است
هر یك سخنت سرود درد و آه‌اســت
بیــت تــو دریست باز بــر کعبه‌ء دل
شعر تو چــو عمر آدمی کوتاه‌است

**واته :**

خەییام! خۆ دڵی تۆ لە دڵمان ئاگایە
هەر پەیڤێکت سروودی دەردو کــوڵە
بەیــتت بۆ کەعبەی دڵ دەرێکی وازە
هۆزانت مینا تەمەنی ئادەمی کوڵە

*

خـیـــام! سخن های تــو نــاتکراراست
جـــام خــرد تــو جاویدان ســرشــاراست
هرکس کــه نخورد جام تو، مســتی کرد
هرکس که بخورد، عاقل و هوشیاراست

**واته :**

خەییام فەرموودەکانت نابنەوە چەندبــارە
جامی ئاوەزی تــۆ لێورێــژە هەتاهەتایــە
هەرکەس بە جامت نەنۆشێ، مەستیدەکا
هەرکەش دەنۆشــێت ئاوەزدارو هــۆشیارە

*

برتر بود از جهان جهــان خیــام
مافوق زمان بــود زمان خیــام
این خیمه‌نشینان جهان خــاکی
یك خیمه ندوزند به سان خیام

**واته :**

بڵندتر بــوو له جیهان ، جیهانی خه‌ییام
له سه‌رووی زه‌مان بوو، زه‌مانی خه‌ییام
ئه‌م خێــوه‌ت نشینانه‌ی جیهانی خاكییه
خێوه‌تێــكیان نه‌دووری میناكی خه‌ییام

*

از خــاك نــیــشابــور صدا آید بــاز
فریــاد دل از دو ســرا آیــد بـــــاز
ای خیمه‌ءآسمان دوصد پاره شوی!
خیام بــه خیــمه‌اش كــجا آید باز؟

**واته :**

له خاكی نیشــابووره‌وه دیســان ده‌نگ دێته‌وه
فریادی دڵ له هه‌ردوو سه‌راوه دیــسان دێته‌وه
ئه‌ی خێــوه‌تی ئاســـمان ده‌ك ته‌فروتوونا بیت
خه‌ییام به خێوه‌ته‌كه‌یه‌وه بــۆ كــوێ بێــته‌وه؟!

*

جا پێویستە بلێین کە لە رۆژگاری ئێستادا شاعیرانی باش و کارامەی چوارینە لە ئێراندا زۆر کەمن...**خورەمشاهی** ئاماژەی بۆ بەرجەستەترینیان کردووە:

" ئەو شێرازەی کە شاعیرانی (غەزەلسەرایی) گەیاندە لووتکە، ئەمڕۆش پێشەنگ و پەیڤداری یەکەمە لە مەیدانی هونەری چوارینەداو، خاوەنی دوو چوارینەسەرای مەزنە: شاپووری پساوەند و ئیرەجی زەبەردەست " و " دەشێت **ئیرەجی زەبەردەست** (**ل:** ١٩٧٤) بە(خەییامی سەردەم) لە قەڵەم بدرێ، کە (پارادۆکسی= هەڤدژی) گەیاندۆتە ترۆپك "

**زەبەردەست** بە باوەڕێکی پتەوەوە ئێژێ :

خیام ز پشت پرده سرمست آمد
با کوزه‌ای از ترانه در دست آمد
بگذشت هزاره‌ای و ما چشم به راه
تا نوبت ایرج زبردست آمد

**واتە :**

خەییام لە پشتی پەردەوە سەرمەست هات
بە گۆزەی تەژی سترانێن بەدەستەوە هات
هەزار ساڵێك گوزەشت و ئێمە چاوەڕێین
تا کو سووڕی ئیرەجی زەبەردەست هات

شایستەی ئاماژەیە ، کە شاعیرانی هاوچەرخی ئێران نزیکەی سێ ساڵێکە بە باندۆری وەرگێڕانی شیعری رۆژهەڵاتی دوور ، نەمازە ژاپۆنی ، روویانکردۆتە هۆنینەوەی (هایکو و تانکا) وە ، کە تا رادەیەك هاوفۆرمی چوارینەیە و، هەندێکیان لەم بیافەدا بەرهەمی نایابیان داهێناوە .

**لە کۆتاییدا ئێژم :**

چ ئەم پاژە و چ پاژەکانی دیکەی ئەم کتێبە (با خەییام باش بناسین) و چ (دیوانی خەییام بە کوردی) بە هەموو لاپەڕەکانیانەوە مشتێکە لە خەرواری پێناسەڤانیی جیهانی خەییامی پیتۆڵ و بلیمەت، بۆیەش هیوادارم ببێتە هاندەری خەڵکانی دی بۆ کارکردن لەپێناو ناساندنی باشترو باشتری خەییام...

هەڵبەتە ئێمەی کورد نەك هەر دەرهەقی خەییام ، بگرە دەرهەقی سەدان بلیمەتی دیکەی جیهان زۆرمان درێغی کردووە ، کە ئەمە پێش هەر شتێك درێغییە دەرهەق رۆشنهزریی نەتەوەی خۆمان .

**ئاخ :** خاك ، خۆڵ ، زەمین

**ئارێشە :** کێشە ، وێم

**ئاسیاو :** ئاش

**ئاکمان :** فەلەك ، خولگە

**ئاڵۆشیڤان :** شەهوەتباز، شەهوانی

**ئامادەڤانی :** ئامادەگی، حوزوور

**ئاوەز :** عەقڵ

**ئەچنەو :** ئاوها، وەسا

**ئەڕا :** بۆ، لۆ.

**ئەڕاو چوین :** بۆ و چۆن؟ چماو چۆن؟

**ئەروەند :** ئاوەزدار، عاقڵ

**ئەڤجا:** ئەوجا

**ئەلیوا :** ئاوها، وەسا، ئەچنەو

**ئەندێشە :** خەیاڵ

**ئەنگارە :** معیار

**ئەوژی :** ئەویش

**ئۆل :** ئایین ، دین

**ئیرەنگە :** ئێستاکە ، کاتی حازر

**ئیسە :** نهۆ، ئێستا، نها، ئیرەنگە

**ئێکئێکە :** یەك لە دوای یەك.

**ئیوەتکردن :** بەخێوکردن  پەروەردەکردن

*

**باڕی :** باڕگ ، ئەبڵەق ، بەڵەك.

**باندۆربار :** موتەئەسسیر

**بانگیار :** پرۆپاگەندەیار، داعییە

**بەرسڤ :** وەلاّم

**بەرسڤدەر:** وەلاّمدەر، موجیب

**بەلەسە :** عیّار

**بەڵەك:** ئەبڵەق ، رەش وسپی ، بازِگ ، بازِی

**بپلژێ :** بژاکێ ، پەژموردەبێ

**بت :** دلّبەر، یار

**بخەزرێنە :** بەتوورِە سەیربکە

**بژنەفە :** ببیسە ، ببیە

**بلەز :** خێرا

**بلەزتر :** زووتر، خێراتر

**بنەتا :** کۆتای ، پێچەوانەی(سەرەتا)

**بیاف :** بوار، کایە ، مەجال

**بیرکاریڤان :** بیرکاریزان ، ماتماتیکزان

**بیهن :** بین ، هەناسە ، نەفەس

*

**پاچڤە :** وەرگێرِان

**پاچڤە پاژییانە:** ترجمە جزئیّە

**پاچڤەوان :** وەرگێرِ

**پاژ :** بەش ، قسم

**پەخشاهۆنراو:** (نثم =هۆنراو+ پەخشان)

**پەروین :** کۆ ، ثُریّا

**پەندیار :** حەکیم

**پەیجۆر :** تویێژەر ، لێکۆڵەرەوە، پەیجۆر

**پەیگیر :** متابع

**پەیگیری :** بەدواداچوون ، مُتابعە

